# پزیشك بۆ هەموان



## کۆمەڵێك زانیاری سوودبەخش بۆ هەموو خێزان و تاکێك



نووسینی: جەلال غولآم ئەحمەد

2016

**ناسنامەی کتێب**

ناوی کتێب: پزیشکی بۆ هەمووان

بابەت: دەرمان و خۆراك

دانانی: جلال حاجی غولآم

دیزاین: جلال حاجی غولآم

چاپخانە: چاپخانەی چوارچرا

نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٦

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نرخ: دە هەزار دینار

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارە ( ١١٣٢ ) سپاردنی ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە.

* بە دایك و باوكم

كە هەمیشە و هەردەم لە خەمی تێگەیاندن و پێگەیاندنمدا بوون.

*بەخوشك و براكانم و سەرجەم هاورێكانم و ئەو كەسانەی هاوكارییان كردووم.

*بە هەموو دۆستانی زانست.

* بە شوێنكەوتووانی ڕێبازە بەرزەكەی پێغەمبەری ئازیز (صلّى الله عليه وسلّم).

* بەو كەسەی كە تەنها وشەیەكی فێركردووم.

## پێڕست

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەکی

سوپاس بۆ خودا جارێکی تر دەرفەتی پێدام کە خزمەتێك بە بواری پزیشکی بکەم بە زمانی شیرینی کوردی. چونکە تا ئێستا هیچ زمانێك وەکو زمانی کوردی بێبەش نەبووە لەم بەرهەمە زانستیانە و وە ئەم جۆرە کتێبانە لە کتێبخانەی کوردیدا بە زمانی کوردی ژمارەیان زۆر کەمە.

لەم کتێبەدا سەرەتا باسی هەندێ نەخۆشی باو ناوی دەرمان و وە لە بەشەکانی دواتری ئەم کتێبەدا باسمان لە خۆراکی تەندروست و ناتەندروست و نەخۆشی و خۆراك و نەخۆشی و ڤیتامین و نەخۆشی و خۆراکی تەندروست و نەخۆشی خۆراکی ناتەندروست و نەخۆشی و میوەکان و بەکارهێنانەکانیان و هەندێ لە ڕووەکەکان و سود و بەکارهێنان و ناوی هەندێ لە میوەکان و ڕێگای چارەسەر بە میوە و سەوزە، وە هەروەها دەرمانە باوەکان و بەکارهێنان و کاریگەری لاوەکی و شێوە و ناوی زانستی و بازرگانی لێوە باسکراوە کە لەبەشی خۆیدا بە درێژی ڕونمان کردۆتەوە. وەباسی هەندێ توخمی کیمیایی و سیفەتەکانیان تێدایە کە لە بەشی توخمەکان و ڤیتامینەکاندایە. لە بەشێکی تریشدا کە بە پۆلێنکردنی دەرمان لە ڕووی چارەسەرکردنەوە (therapeutic classification of drugs) دەست پێ دەکات، واتە پۆلێنکردنی دەرمان بەپێی جۆری ئەو نەخۆشینەی دەرمانەکەی بۆ بەکاردێت. کە لەم بەشەدا زیاتر جەختم لەسەر شێوەی دەرمان و پێکهاتەکەی کردووەتەوە ئەمەش ڕێخۆشکەر دەبێت بۆ ئەوەی بزانین کە چۆن دوو دەرمان پێکەوە لە ڕەچەتەیەکدا بنوسین، وە چۆن دوو دەرمان پێکەوە بنوسین کە کارلێك لە نێوانیاندا ڕوونەدات. وە شێوەی دەرمانی گونجاو حەب یان کەپسول یان شاف و سەسپێنشن یان قەترە یان گیراوە یان پاودەر و...هتد بەپێی

حاڵەتی نەخۆش بەکاربهێنین بۆ نموونە نەخۆشێك برشیتەوە نەتوانێت حەب بەکاربێنێت ئەوا شاف بۆ بەکاردێنین. لێرەدا بەتەواوی شارەزای هەموو شێوەکانی دەرمان و پێکهاتەکانی دەرمان دەبین، وە بۆ ئەوەی بتوانین دوو دەرمان لەیەك حەبدا بۆنەخۆشێك بنوسین و بۆی بەکاربێنین کە ئەمەش لەسەر نەخۆش ئاسانتر دەبێت.هەر دەرمانە و حەبێك یان هەر شێوەیەکی تری دەرمان بێت چی لە ڕووی دەرونیەوە وە چی لەڕووی ئابوریەوە.

جلال حاجی غولام ٢٠١٥/٣/١٥

## بەشی یەکەم

## خۆراکی ناتەندروست:

### موعتادبوون: addiction

ڕاهاتنی جەستە یان دەرونە لەگەڵ بەکارهێنانی مادەی بێهۆشکەر بە تەدریجی و یان بەکارهێنانی ڕۆژانە، بەم شێوەیە جەستەی لەگەڵی ڕادێت و پێیەوە پەیوەست دەبێت.
یان خوی نەخۆشە لە بەکارهێنانی مەوادی ژەهری هاندەر یان هێورکەرەوەی بەشێکی کۆئەندامی دەمار بەشێوەیەك کە شادی پێدەدات و هەستی دەرونی و وەزعی عاتفی دەگۆڕێت.

### ناساندنی هەندێ لە مادە هۆشبەکان: Drugs

#### الكهول: alcohol

لاواز کەری کۆئەندامی دەماری ناوەندیە و هێورکەرەوەیە، لە ڕێی دەمەوە بە شێوەی شەراب، ناوجۆ، ویسکی، بەکاردەهێنرێت، بۆ دژە هەوکردن لە نەشتەرگەری دا بەسوودە، لە دەرزی لێدانەکاندا بەکارهێنانی بە سوودی هەیە -گۆڕانی کەسایەتی، لاوازبوونی حافیزە، وە بێ ئیختیاری لە میزکردن و پسایی کردندا و تەشەنوج، لە کاریگەری زیانبەخشیەکانیەتی.

#### ئەمفیتامین: amphetamine

هۆی موعتادبورن دەبێت، بەشێوەی حەب بەکاردێ. هۆی کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن دەبێت و بەڵام چونکە مەترسی موعتادبوونی هەیە خواردنی قەدەغەیە. هۆی بێ قەراری، بێ مەیلی، گۆڕانی ڕەفتار دەبێت.

#### باربیوچرەیتەکان: barbiturates

بەکارهێنانی بە تەرتیب و ماوە درێژی ئەم دەرمانە موعتادی دەدات بەو کەسەی کە بە کاری دەهێنێت بە شێوەی کەپسول و حەب و ئەمپوول بەکاردێت، بە عینوانی خەوهێنەر لە

حاڵەتی ماوەکۆتا باشە. جگە لـەم حاڵەتـە زیـان بەخـشە. هـۆی خـەمۆکی و لاوزاکردنـی حافیزە، نابەرپرسیاریتی دەبێت.

**بێنزۆدیازیپینەکان:** benzodiazepines

لاوازکەری کۆئەندامی دەماری ناوەندین و توانای موعتادکردنیان هەیە بەشێوەی حـەب و کەپسوول و ئەمپول بەکاردێ بۆ بێ خەوی و قەڵەقی و دڵەڕاوکێ بەشێوەی کاتی بـەکاردێ. ئەگەرساڵەها ئەم دەرمانە بەکاربهێنرێت مەترسی هەیە.

**کۆکاین:** cocaine

بەکارهێنانی بە تەرتیبی کۆکاین موعتادکەرە، بەشێوەی ئیستنشاقی یـان دەرزی بـەکاردێ. بە عینوانی بەنجی مەوزوعی باشە.

بەکارهێنانی زیادی ئەم دەرمانە بێ خەوی، کـەم بوونـەوەی کـێش، هێڵنجـادن، پەسـتانی بەرزی خوێن و نارەحەتیەکانی دڵـی دروسـت دەکـات و کـراکیش هاوشـێوەیەکی تـرە لـە کۆکاین.

**ئیکستاسی:** ecstasy

هاندەری کۆئەندامی دەماری ناوەنـدی یـە، بەشـێوەی حـەب و کەپـسوول بـەکاردێ بـە عینوانی ڕەقسهێنەر لە نشـیگەکان و میوانیەکان بەکاردێت. کاریگـەری دەروونـی دەرمـانی باشی هەیە و بەڵام بەشـێوەیەکی کرداری مۆڵـەت پـێ نـەدراوە و کاریگـەری موعتادکـەری هەیە.

تێك چوونی خەوو خەمۆکی دروست دەکات و نارەحەتیەکانی ددان و قفڵ کردنی دەم و چاو دروست دەکات.

**جی ئێچ بی:** GHB

لەڕێی دەمەوە بەکاردێت و بەشێوەی شل لە بوتڵدا دەفرۆشرێت هۆی هیلاکی و بێخەوی دەبێت، سەرگێژبوون و بێ هۆشیش دروست دەکات.

**کیتامین:** ketamine

توانایەکی موعتادکەری کەمی هەیە، بەشێوەی حـەب وکەپـسوول وگـیراوە بـەکاردێت، بەکارهێنانی زیاد لە ڕادەی ئەم دەرمانە تەشەنوج و پەککـەوتنی دڵ و هەناسـەدان دروسـت دەکات.

**خات:** khat

موعتادکەرە و هۆی قەبزی و برینی گەدە دەبێت هۆی نەزۆکی و پەستانی بەرزی خوێن دەبێت.

**ئێل ئێس دی:** LSD

هۆی موعتادبوون دەبێت و بەشێوەی حەب بەکادێت و خەمۆکی توند دروست دەکات زیاد لە ڕادە هۆی گێژی و سەرسوڕخواردن دەبێت.

**ماری جوانا:** MARIJUANA

وڕێنەی هەیە، موعتادی هێنەرە، حافیزە و توانای شۆفێری تێکدەدات و پەستانی خوێن دادەبەزێنێت پڕحەرف و مەستن و نیشتیهایەکی زۆریان هەیە و کێشەکانی دڵی و زوو منداڵ بوون دروست دەکات.

**مێسکالین:** MESCALINE

توانای موعتادکەری هەیە و بەشێوەی کەپسوول بەکاردێت وە هۆی تێکچوونی بیر و کێشەی جگەری دەبێت بۆ مەبەستی ئەم لایەنەش تەشخیص نەکراوە. ڕشانەوەو ترسیان هەیە و ڕەفتاری توڕەیی و شەڕانگێزیان پێ پەیدا دەکات.

**ئەفیونەکان:** OPIOIDS

دەمار لاواز دەکات و موعتادکەرە. کاریگەری دژە ئازاری هەیە بەشێوەیەکی خێرا موعتادی دروست دەکات بەشێوەی دەرزی لێدان یان تۆز ئەم دەرمانە بەکاردەهێنرێت، کەمبوونەوەی ئارەزووی سێکسی و بەدخۆراکی و قەتع بوونی عادەتی مانگانە دروست دەکات، مەترسی ئایدز، هیپاتیت، سیفلیس، لەم کەسانەدا زۆرترە.

**نیکۆتین:** NICOTINE

دەمار لاواز دەکات و موعتادکەرە و خەمۆکی بێ توانایی لە بیرکردنەوەدا دروست دەکات، ئارەزووکردنی جگەرەکێشان لەم کەسانەدا زیاترە. بەشێوەی جگەرە یان پیپ بەکاردێت بە عینوانی مێروو کوشتن بەکاردەهێنرێن. نەخۆشی دەماری و دڵی و پەستانی بەرزی خوێن لەم کەسانەدا زۆرترە. ددانەکان زەرد دەکات و بۆنی دەم ناخۆش دەکات.

## نایتەرەیتەکان: NITRATES

فروانکەری دەمارن. کاریگەری موعتادکەری هەیە. ئەمپوڵەکە دەشکێنن و دەرمانەکە هەڵدەمژن بۆ ئازاری سنگ باشە، بەڵام ئەبێت لە ژێر چاودێری پزیشك بەکاربێت هۆی نارەحەتی دڵی و ژەهراویبوون دەبێت و زەختی چاو بەرزدەکاتەوە و کوێری دروست دەکەن و ڕەنگی پێست شین دەکەنەوە.

## سۆڵڤێنت: solvents

هۆی بێ هۆشی و وڕێنەن موعتادکەرن. پارچەیەك لۆکەی تێکەڵ دەکەن و کۆڵەکەی لووتی پێ دەگرن لەبەرهەمە جوانکاریەکاندا بەکارهێنانی هەیە. پەرتبوونی حەواس، سەرگێژبوون، خەواڵویی و لە دەستدانی هۆشیاری دەدات. ڕەفتاری ناجێگیر و خوی ناشرینیان هەیە. کۆکەیان هەیە و دەوروبەری دەم و لووتیشیان سورە.

## فینسکلیدین: phencyclidine

موعتادکەرە و ناوەندە کۆ ئەندامی دەمار لاواز دەکات بەشێوەی تۆز و حەب و ئەمپوول بەکاردێت هۆی وڕێنە و تێکچوونی بینایی و ناتەواوی حافیزە و ڕەفتارە شەرەنگێزی هێنەرەکان دەبێت.

## دەرمانە وەرزشییە با مۆڵەتەکان:

لە ڕێگەی میز و ئەو فەحسانەی کە بۆ وەرزشکاران ئـەنجام دەدرێ ئـەتوانێت بـە بـوونی دەرمان لە لەشـی وەرزشـکاردا پـەی ببرێـت کۆمیتـەی نێودەوڵـەتی و شـەش گـروپ لـە دەرمانەکانی بەشی دوپینگ ئاشکرای کردووە کە:

١-هاندەرەکان

٢-دژە ئازارە سڕکەرەکان ( وەکو مۆرفین و کۆداین )

٣-ستیرۆیدەکانی ئەنابۆلیکی ئەندرۆجیی.

٤-میزپێکەرەکان

٥-هۆرمۆنەکانی پێپتیدی

٦-دوپینگی خوێن نایاسایە.

دەرمانە مۆڵەت دراوەکان بۆ وەرزشکاران:

ئەنتی بایۆتیکەکان ( جێنتامایسین، پەنسلین، ئەمپیسیلین و....)

ئەنتی هیـستامین کـە پێکهاتـەی کلـۆرفینرامین یـان دیفینهایدرامینـە و هـۆی خـەواڵویی وەرزشکار دەبێت دەرمانەکانی دژە ئیلتیهاب وەك ئیندۆمیتاسین، پرۆفین و..... کەهۆی کـەم بوونەوەی ئـازار دەبێـت و ئـازاری وەرزشـکاران لادەبـات و هـۆی تێکـچوونی وەرزشـکار دەبێت.

دەرمانەکانی ڕەبۆ ئەگەر پێکهاتەی ئیفیدرین یان فینیلئیفرین بێت ترسناك و قەدەغەیە بەڵام سالبیوتامۆڵ و تێربیوتالین کێشەیەکیان نیە.

دوپینگی خوێن نایاساییە و قەدەغەیە.

کافائین قەدەغەیەو بە بڕی زۆر لـە میزدا دەبینرێت.

کۆکاین نایاسایی و موعتادکەرە و هۆی تەشەنوج و نارێکی لێدانی دڵ و مردن دەبێت.

دەرمانەکانی دژی کۆکە وەك کۆداین، سیدۆئیفیدرین دوانزە سەعات پـێش لـە پێـشبڕکێ بەکارنەهێنرێت.

دەرمانەکانی دژی سکچوون – ئەگەر کۆدایینی تێدا بێت خۆتـانی لـێ دوربگـرن و بـەڵام دایفینۆکسیلەیت و لۆپیرامید و بەکارهێنانی دەرمانەکانی تای یۆنجە _ ئەوانە زیاتر ئیفیـدرین یان فینیلئیفرین یان فینیلپرۆپانۆلامیننیان تێدایە قەدەغەیە.

**لینیمیت** _ ئەم دەرمانە ئازار کەمتر دەکاتەوە بەڵام نەبێت ئاگاداری بیت لەبەرئەوە هـۆی تێکچونێکی زیاتر دەبێت.

**نیکـۆتین** _ ڕۆیـشتنی خـوێنی ماسـولکەکان کـەم دەکاتـەوەو توانـای ماسـولکەی کـەم دەکاتەوەو بەکارهێنانی قەدەغەیە.

دژە ئازارەکان وەك کۆداین و مۆرفین بۆ چالاکیە وەرزشیەکان قەدەغەیە بەڵام ئەسـپرین و پاراسـیمۆڵو سپرای و مەلهەم یان کرێم قەدەغە نیە وە ٢٤ سـەعات پـێش لـە پێـشبڕکێ لــە دەرمانەکانی دژە ئازار خۆتان دووربگرن.

## باسکردنی هەندێ لە مەوادە بێهۆشکەرەکان:

تلیاك: opium

تلیاك بەشێوەی ڕاستەوخۆ لەگیایەك بەناوی خەشخاشەوە وەردەگیرێت. ڕوانی ئەم گیایـە (خەشخاش بەشێوەیەکی سەرەکی لە ئاسیای بچوك و هیند و چین ئەنجام دەدەرێت.)

لـە سەرەتادا و لـەکاتی کۆندا بەکارهێنانی لـە ئاسیا و میـصر و یۆنـان ڕەواجـی هـەبووە و تەنها پاش لە سەدەی پانزەهەمی زایینی لە ئەوروپا ڕەواجی پەیـداکردووە و ئـەوەیش نـە بـە جۆنێتی و چەندێتیە کە لـە ئاسـیان بەکاردێت.

تلیـاك هێشتا لەنێو زۆرێك لـە نەتەوە و گەلـەکەکانی ئـەوروپایی نەناسـراوە و لانـی کـەم دەتوانێت بڵێت کە زۆرێك لـەوان تەنها ناوی ئەم مادە بێهۆشکەرەیان بیستووە.

بەکارهێنانی ئەم مادە بێهۆشکەرە بەو وەسیلانەی بەناوی وافور ئەنجام دەدرێـت و یـان لــە هەندێ قۆناغەکانی پێشکەوتنی بەشێوەی خۆراکی بەکاردێت.

بەکارهێنانی ماوەدرێـژی تلیـاك هـۆی دەرکـەوتنی موعتـادبوون دەبێـت کـە لێـرەدا بـە باسکردنی هەندێ لە تێبینیەکان کاریگەریـەکانیان ئاماژە دەکەین.

سەرەتا ئەو كەسە توشی بێهێزی و خۆشبینی و كەیف دەبێت و جوڵەكانی هێواش و لەسەرخۆ و نەرم دەبێت. لەم قۆناغەدا، ئەو كەسە ئارەزوی زیادی بە چالاكی جەستەیی نییە. پاش لە ماوەیەك كاریگەری نەشیاو دەردەكەوێت كە پێك دێن لە:نیگەرانی و ترس، بێخەوی، و هەتا نەتوانینی ئەنجامدانی كاری سێكسی. بەكارهێنانی بەردەوامی ئەم مادە بێهۆشكەرە، ڕاستەوخۆ ئیرادە و توانا و ڕەوشتی كەسەكە دەكەوێتە ژێر كاریگەری ئەم مادە بێهۆشكەرەوە. نیشانەكانی سەرەوە، كاریگەریەكانی دەرونی بەهۆی بەكارهێنانی تلیاكەوە بووە، هەندێ لە كاریگەریەكانیش تێكچونەكانی جەستەیی دەگرێتەوە وەك بێ ئیشتیهایی، قەبزی، لاوازی، بێهێزی، نارەحەتیەكانی هەرسی، نارەحەتیەكانی پێستی، وەك خورانی پێست، تێكچون لە ڕۆیشتنی خوێندا كە دابەزینی پەستانی خوێن و تێكچوونی دەمارەكان دەگرێتەوە، زەرد و بێ ڕەنگبوونی پێست، تێكچونەكان و نارەتیەكانی دەماری وەك لەرزینی دەست و پێ.

لەبەرئەوەی تەواوی كۆئەندامەكانی لەش بە تایبەتی دەمار و غیرەی ئەو كەسە دەكەوێتە ژێر كاریگەری تلیاكەوە و بەشێوەیەكی فراوان توشی تێكچونەكان و ناتەواویەكان دەبێت.

لەم هەناوەدایە كە دەتوانی بۆ ئەو كەسە ناوی نەخۆشی بەكاربهێنی و نەخۆش ڕۆژ بە ڕۆژ لاوازتر و زەبونتر دەبێت.

هێشتا ماوەی كاتی تایبەت لە بواری بەكارهێنانی تلیاك بۆ دروستبوونی موعتادبوون بەوە دیاری ناكرێت و بەڵام بەشێوەیەكی ئاشكراو دیار بەكارهێنانی بەردەوامی تلیاك ماوەی كەمتر لە یەك مانگ موعتادبوون دروست دەكەن.

بڕی بەكارهێنانی بە تەدریجی زیاد دەبێت لەبەرئەوە بڕی بەكارهێنانی پێشتر خۆشی و نەشەی بۆ دروست ناكات.

نیشانەكانی سەرخۆشی و خوماری پاش لە چەند سەعاتێك لە كەم بەكارهێنانی مادەكە دەردەكەوێت. (بەستەی مادەی بێهۆشكەر بەپێی بڕی بەكارهێنانە) كە بەشێوەیەكی ئاسایی لەنێوان ١ تا ٥ سەعاتدا دەبێت.

لەكاتی بەكارنەهێنانی زیاد لە یەك ڕۆژ، نیشانە سەرەتاییەكانی دەردەكەون: باوێشكدان، نارەقكردنەوەی زۆر، ئاوكردنی لوت، هاندەری، بێ قەراری وپاش لەوە لەرزین و

هەستکردن بە سەرما و زیاد لەوەش سکچون و ڕشانەوە و سەرئێشە و ئازار لە ناوچە جیاوازەکانی لەش، کە لەوانە دەبێت بە ئازارەکانی ئێسکی ناوببرێت.

کۆتاترین نیشانەکانی ورێنە و تەوەهوم و کارە شێتی ئامێزەکان دەگرێتەوە کە لە هەندێك لە لایەنەکاندا ئەنجامەکەی مردن دەبێت.

## شیرەی تلیاك:

ئەم مادە لە سوتاوی تلیاکەوە بەدەست دێت و لەڕێگەی وەسیلەکانی بەناو نیگارکێشانەوە دەبێت. شیرە لە هەندێ لایەنەکانی تریش بەشێوەی خۆراکی بەکاردێت. ئەم مادە بڕێکی زۆر لە مۆرفینی تێدایە. خۆشی و نەشئەی نیشانەکانی ئەم مادە بێهۆشکەرە لێکچونێکی زیادی بۆ تلیاك هەیە و بەم بەراوردەیە کە لەو بەهێزترە.

## مۆرفین

لە لێوەرگیراوەکانی تلیاکە. ئەلکەلۆیدێکە کە بێهۆشکەرە و دژی ئازارە و بەشێوەی ئاسایی بەشێوەی مۆرفین سەلفەیت بەکاردێت. بەکارهێنانی مۆرفین بەشێوەیەکی ئاسایی بەهۆی دەرزی لێدانی دەماریەوە ئەنجام دەدرێت و بەکارهێنانی پەیوەستبوونی مۆرفین ژەهراویبوون بە مۆرفین (مۆرفینیزم) دروست دەکات کە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە خۆی یەکێکە لە مەوادە نارکۆمانیاکان (بێهۆشکەرگەرایی شێتی)، کە ئەمەش واتە ئارەزووکردنی نەخۆش بۆ بەکارهێنانی دەرمانە بێهۆشکەرەکان بە مەبەستی لابردنی ئازار یان ناڕەحەتی.ئەم مادە یەکێك لە ترسناکترینی جۆرەکانی مادە بێهۆشکەرەکانە و لە تایبەتمەندییە دیارەکانی مۆرفین بەکارهێنانی زیادی ڕۆژانەی ئەم مادە کە پاش لە ماوەیەك ئەنجامەکەی ژەهراویبوونی بەردەوامی کەسەکە دەبێت. ئەم ژەهراویبونە وەك تێکچونەکانی جەستەیی و دەرونی و جەستەیی دەردەکەوێت وەك لاوازی، ڕەنگپەڕینی دەم و چاو، بێ ئیشتیهایی، لەرزینی پەنجەکان، ترپەی دڵ و کەمخەوی، کەمبوونەوەی ئارەزووە سێکسییەکان و بە شێوەیەکی تەواو ئەو نیشانانەی کە بەکارهێنانی بەردەوامی تلیاك دروست دەکەن، لێرەشدا دەرکەوتووە بەڵام لە ڕووی توندی، جیاوازی زۆر تێبینیکراوی هەیە.

شوێنەواری دەرونی و کەسایەتی مۆرفینیسم پێك دێت لە: درۆکردن، نەمانی هاوسەنگی سۆز، دزی، قاچاغ فرۆشی، فەحشا و داوێنپیسی و بەشێوەیەکی تەواو تێکچونی کەسایەتی و

کەسایەتی دژی کۆمەڵایەتی دروست دەکات. ڕێگر و وەستێنەرەکانی زیهنـی و ڕەوشـتی بـە تەواوی لە نێو دەچـێت و کەسـی نـەخۆش بـە هـەر کارێـك کـە مەبەسـتیێ و بیـەوێ بـۆ دەستکەوتنی مۆرفین دەیکات.

**هیرۆین:** heroin

یەکێکی تر لە لێوەرگیراوەکانی تلیاکە کە بەشێوەی تۆزی سپی ئامادە دەکرێت. ئەم مادە بێهۆشکەرە بەناو شەیتانی سـپی بەناوبانگـە. موعتـادبوون و کاریگەریـەکانی هیرۆیـن وەکـو مۆرفینە.

هیرۆین مادەیەکی مەرگهێنەرە کە کەمتر موعتاد توانای بۆ تەرککردنی هەیە. تا ئێستا تەنها ٤٠٠ لە موعتادەکانی هیرۆیـن توانایـان بـۆ تـەرککردنی هـەبووە، کـە زۆرینـەیان زوو بـە ڕازیبونیان کەسانێکیان لێ پێکهاتووە کە هەمان جاری یەکـەم تـەرکیان کـردووە و ئـیتر بـە دواری هیرۆیندا نەڕۆیشـتوون. لەم ناوەندەدا زۆر دەگمەنە کەسانێك کە پاش لە موعتادبوون یەکسـەر ئەو مادەیان تەرك دابێت.

ئەو کەسە پاش لە موعتادبوون بەردەوام بە هیرۆین توشی تێکـچونی کەسـایەتی دەبێـت و توشبوو بە هەمان کاریگەرییەکانی دەروونی-کەسایەتی بـەهۆی موعتـادبوون بـە مۆرفینـەوە وەك دزی، زۆر بلێیی، کەمبوونی هاوسـەنگی سۆز، قاچاخی مـەوادی بێهۆشـکەر، فەحـشا و داوێنپیسی و...دەبێت.

پێکهاتەی تری دروستکراو لە مۆرفین هەیە کە کمتر لە مۆرفین هیرۆین و تلیاك بـاوترە و تەنها بە ناوهێنانی هەندێکیان ئاماژە دەکەین، پێکهاتە باسکراوەکان بریتین لە:

١-کۆداین یان مەتیل مۆرفین کە ١٠ ئەوەندەی مۆرفین لاوازترە.

٢-میتادۆن هەندێ لە پێکهاتەکانی ئەم گروپەیە توانای دیاریکراوی فەوقولعادەی هەیە و ژەهراویکەرن.

٣- دیمیرۆڵ

٤-گروپی مۆرفینەکان: لەم گروپە میتامۆرفیناڵ و درۆمۆریناڵ هەن کە زمنـی هاوشـێوەی زیادی هەیە لەگەڵ مۆرفینی سروشتی تا ڕادەی ٥ جار لە ئەو بەهێزترن.

٥-لۆدانیم سیدنیهام: ئەم مادە بێهۆشکەرە هەندێك جار بە عینوانی جێگـرەوەی تلیـاك و مۆرفین بەکاردێت و شێوەی بەکارهێنانیشی بەشێوەی خواردن یان دەرزی لێدانە.

## هاندەرەكان:

### ١-كۆكا و كۆكاین

ڕوانی كۆكا كە درەختێكی بچوكە، كۆنە كە لە هەندێ وڵاتانی ئەمریكای لاتین بەتایبەتی لە بولیوی و پرۆمتداوڵە.

كۆكاین ئەلكەلۆیدێكە بە فۆرمولی $C_{17}H_{21}NO_4$ كە لە گەڵای درەختی كۆكا (Erythroxylon) بە دەست دێت و بەشێوەی دەستكردیش ئامادە دەكرێت. ئەم دەرمانە پاودەرێكی ڕەنگ سپییە، كە سیفەتی بێهۆشكەری بۆ دەمارەكان هەیە و لە پزیشكیدا ئەم مادەیە بە عینوانی بێهۆشكەری مەوزوعی بەكاردەبەن.

ڕێگەی باوی بەكارهێنانی ئەم دەرمانە بەشێوەی جوینی گەڵاكانی درەختی كۆكا دەبێت، كە هەر كیلۆگرەمێكی ٥,٦ تا ٥,٨ گرەم كۆكاین هەیە و موعتادەكان تا ٢٥٠ میلی گرەم لەم گەڵایانە دەجوون. لە ڕێگەی لوتیشەوە كۆكاینی پاك یان تێكەڵكراو لەگەڵ بۆریك ئەسید بەكاردێت. بڕی بەكارهێنان ئەتوانی لە هەر جارێكدا ٥ سانتیگرەم تا ٦ گرەم، بەستەكەی بەپێی بڕی موعتادكەری بەكارهێنەر گۆڕانی بەسەردا دێت. كاریگەرییەكانی جەستەیی پاتۆلۆجی (نەخۆشی زانی) كۆكاین پێك دێت لە: برینی قورقوڕاگە و ئەكزیمای لوت، كۆریزا (نیشانەكانی ئاوكردنی توندی لینجە پەردەی لوت بەهۆی ئیلتیهابی تیژی لینجە پەردەوە)، كۆكاین بە پێچەوانەی مۆرفینەوەیە، تویكڵی مۆخ هاندەدات و خرۆشان و هەتا بێخەویش دەبێت.

هەروەها كۆكاین ئارەزووە سێكسییەكانیش زیاد دەكات. كرانەوەی مێشكی بەهۆی بەكارهێنانی كۆكاینەوە تا ڕادەی ٤ تا ٦ سەعات بە درێژی ئەنجام دەدرێت و لەم حاڵەتەدا، ئەو كەسە هەست بە بەختەوەری و ڕازیبوونی مێشكی دەكات. بەشێوەیەكی ئاسایی وڕێنە سێكسییەكان، بیستنی و بینینی و لە هەندێ لایەنیشدا تێكچونی ژیری تیژ پاش لە تێپەڕینی حاڵەتی كراوەنە لەو كەسەدا دێنێتە بوون.

**كراك: crack**

ئەم جۆرەی كۆكاین بەشێوەی جگەرە دەكێشرێت و نەك بەشێوەی بەرزەكێشانی لە ڕێی لوتەوە و كاریگەرییەكانی نەشئەیی و خۆش ئەمیش زۆر توندتر لە جۆری كۆتاییە.ئەم جۆرە

لە ڕووی چۆنێتییەکانی تریشەوە وەك خێرایی نەشئەیی و خۆشی ڕازیبون پێی و سەرخۆشی و هەروەها لەڕووی موعتادبونەوە زۆر زۆر بەهێزتر و توندترە لە جۆری بەرزەکێشان لەڕێی لوتەوە.

ئەرنۆڵد واشتۆن دەرونناس و دەرماناسی نەخۆشخانەی ئۆکز لە سایتی نیوجەرسی دەڵێت: کراك موعتادکەرترین جۆری مادە بێهۆشکەرەکانە کە تا ئێستا ناسرابێت.

موعتادبوون بە کراك زۆر خێرا و لە ڕاستیدا لەحزەییە. بەکارهێنانی کۆکاین لەڕێی لوتەوە ئەتوانێت ٢ تا ٥ساڵیش بەبێ کاریگەرییەکانی موعتادبوون بەردەوام بێت بەڵام ئەم بابەتە لە لایەنی کراکدا ڕاست نیە. بەکارهێنانی کراك بەشێوەی شادپێدان مەسیر نییە. مامەڵەکەرەکان کراك لە تێکەڵکردن لەگەڵ جوشی شیرین بە دەست دێنن. مەعجونێك کە ئاسایی ٧٥٪ کۆکاینە.مەعجون ڕەق دەبێت و پاشان بە شێوەی وەرەقەی هاوشێوەی چیپس دەبڕدرێت.

یەك تکەی بچوکی کراك کە هەندێ لە کاتەکان بەناوی چورایەکی کراك ناودەبرێت، ماوەی ٢٠ تا ٣٠ خولەك نەشئەیی دروست دەکات کێشانی ئەم بەرهەمانە لەڕێی نەیەوە ئەنجام دەدرێت.

**کافائین:** cafaine

مادەیەکە هاندەری ناوەندە کۆئەندامی دەمارە بە شێوگی $C_8H_{10}N_4O_2$. بەکارهێنانی ماوەدرێژی ئەم دەرمانە بەهۆی زیادبوونی هاندانی هەستی بەرگەی دەگرێت. لەکاتی بەردەوامبوونی هاندانەکان، کەسەکە توشی کەم ئیشتیهایی دەبێت و عاقیبەتەکەشی کەم کێشی، دڵەڕاوکێ، تورەیی، حەسایەت و کەمخەوی بە دی دێت.

لەگەڵ بەکارهێنانی بەردەوامیدا، لەکاتی وازهێنانی کتوپڕی ئەم مادە، کەسەکە هەست بە هیلاکی توند دەکات و لە هەندێ کاتەکاندا حاڵەتی خەمۆکی دروست دەکات.

**نیکۆتین:** nicotine

ئەلکالۆیدێکە ژەهری لە توتنەوە بە دەست دێت و لەوانەیە لە ڕێگەی پێشەسازی و دەستکردیشەوە بەرهەم بێت. ژەهراویبون بەهۆی نیکۆتینەوە نیکۆتینیزمی پێدەگوترێت.ماماوەندی تەمەن نیکۆتین لە ڕۆیشتنی سوری خوێن ڕادەی ٢ تا ٣ سەعاتە و ڕاستەوخۆی بە سەر دەماری سەمپەتاوی کاریگەری بەجێ دەهێڵێت.

نیکۆتین مادەیەکە کەلە تۆباکۆ و توتن بە دەست دێت و ڕێگەی بەکارهێنانەکەشی کێشانی جگەرە و چیق و پیپ و قلیانە کە بە سەرنجدان بە مەرجەکانی فەرهەنگی و باوێتی، لەیەکێك لەم ڕێیانە یان لە هەموو ئەوانە سود وەردەگیرێت. لێرەدا کورتەیەك لە دوکەڵاوییەکان و بە تایبەت لە جگەرە چەند بابەتێك دەخەینەڕوو:

لە دیدی دەروونناسەکانەوە، موعتادبوون بە دوکەڵاوییەکان دوو ڕووی بنچینەیی دەگرێتەوە کە دەرونی و فسیۆلۆجیە. ڕووە دەرونیەکانی ئەمانە دەگرێتەوە گرتنی جگەرە بەلای پەنجەکانی دەست، ئاگردان و داگیرساندنی جگەرە، فووکردن...کە ئەم لایەنانە گرنگترین ڕووەکانی دەرونی موعتادبوون بە جگەرە پێك دەهێنن. لە ڕوویەکی ترەوە هەڵمژینی دوکەڵی جگەرەهۆی مژینی نیکۆتین دەبێت بە بڕی زیادکراوی ڕۆژانە و وەك دەرمانە بێهۆشکەرەکان ئەنجامی ئەوەش جۆرێکی موعتادبوونە. کێشانی جگەرە سەرەتا لە حاڵەتی شادی و سەرگەرمییەوە دەست پێدەکات، یان بەهۆی فشەکردن و خۆبەزلزانینەوە دەست پێدەکات، بەپێی ئەو شایەتە کۆمەڵایەتییانەی کە هەن، زۆرێك لە جگەرەکێشەکان، سەرەتا تەنها مەبەستی سەرگەرمی و شادییان هەیە کە ئەوەش هەمووی بەزۆری بەهۆی لاسایی کردنەوەوە دەبێت.

## زیانەکانی جگەرە:

ئەم لایەنانەی خوارەوە کەباسی دەکەین ئەمە تەنها کورتەیەکە دەربارەی جگەرە:

لەڕووی دەرونی دەماریەوە: جگەرە هۆی لەرزینی پەنجەکانی دەست دەبێت، حەساسیەتی زیاد لە ڕادە و هاندانی زیاد، ئێش و ئازار، سستی و لەرزە لەرز، تێکچون لە هێزی بیرکردنەوە و هەستپێکردنی ڕاستەوخۆ، لە هەندێ لە لایەنەکاندا بەدگومانی، خەجاڵەتی، و هەتا لە دەستدانی بڕوا بەخۆبوون دەبێت.

بەزۆری ئەو کەسانە نیگەرانی وپەرێشانی مێشکیان بە جگەرە بە ڕێ دەکەن. بێ ئاگان لەوە کەجگەرە خۆی هۆی زیادبوونی خەفەت و پەرێشانی مێشك دەبێت.

لە ڕووی جەستەییشەوە: ئەتوانێت حاڵەتی مرۆڤ بەرەو خراپتر ببات و جگە لەوەی دەبێتەهۆی شێرپەنجەی سی، جۆرەکانی نەخۆشییەکانی دڵ نەخۆشی دەماری، کەمبوونی

توانــای پــاوەتی، لەبارچــوونی کۆرپەلــە و نوقــسانبوونی لــە ژنــانی ســکپڕ و لــە کاتی لەبارنەچونیدا، لانی کەم زیانــە کانی نــاوەوەی منداڵــدان بــۆ کۆرپەلــە، کاریگــەری لەســەر کۆئەندام و ڕێڕەوی میز هەیە، کاریگەری لەســەر ڕژێنــە دەردەرەکــانی نــاوەکی و هــەروەها دەبێتەهۆی نەخۆشی سی و ئەمفیزم و جەڵتەی دڵ و ڕەقبوونی خوێنبەرکان و کۆتایش مــردن بەهۆی یەکێك لەم نەخۆشیانەوە ئەگەر بەتایبەتی نەخۆشییەکانی دڵ بێت.

## ماری جوانا یان حەشیش: marijuana

مــاری جوانــا گــەڵا کــان و جوانــەکانی گیــایی کانــابیس ســاتیڤایە، کــە ژەهراویبــوونی موعتادکــەری هەیــە و بەشــێوەیەکی ئاســایی بــەهۆی جگــەرەوە لــە ڕێــی موعتادەکانــەوە بەکاردێت.

ڕوانی ئەم گیایە لە هیندستان و ناوەندی ئاسیا و ئێران ئەفریقای باکور و هەنــدێ وڵاتــانی ئەوروپایی وەك یۆنان ئەنجام دەدرێت. ئــاوگی مــاری جوانــا خاســیەتی دەرمــانی هەیــە (دژی وشکی پێستە) بەڵام بەکارهێنانی ناوەکی هۆی موعتادبوون دەبێــت. ئــەم دەرمانــە لــە ئێــران وڵاتەکانی ڕۆژهەڵات بەناوی حەشیشەوە ناوی دەرکردووە و لە ئەفریقای باکور ناوبراوە بــە شیرا، ئاوگی ئەم مادە بەشێوە تەختــە (پــلاك)بــەکاردێت و بەشــێوەی تێکــەڵ کــردن لــەگــەڵ توتنیش بەکاردێت و دەکێشرێت، ئەم تێکەڵە لە ئەمریکا ماری جوانای پێ دەوترێت.

ئەم مادەش وەك کۆکاین هۆی خوماری و سەرخۆشی دەبێت بەڵام شوێنەواری زیانــەکانی بەسەر ڕووی مێشکەوە هەیە و ئەو حاڵەتانــەش پێــك دێــن لــە: زیــادبوونی هەســتکردن بــە بڕوابەخۆبوون، هەستکردن بە ئارامی، هەستکردن بە فڕین بە ئاسماندا و نــەمانی دیــاریکردنی دووری شوێنەکان، زیانەکانیــشی کەمبونــەوەی توانــای زیهنــی و تێکــچونی کــات و شــوێن بەشــێوەیەکی تــەواو، تێکــچونی هەســت و وریــایی و ئاگــاداری و تێکــچونی بەربەســتە ڕەوشتییەکانە.

بەپێچەوانەی تەصەوری هەندێ لە کەسەکانەوە، حەشیش توانای سێکسی زیاد ناکــات و بەڵکو کەسەکە کاریگەری دەرکێکردنی نادروست لەوەی کــە ڕەگــەزی بەرامبــەری وەك دڵداری خۆی هەست پێ دەکات و حاڵەتی درۆیی ئــارەزوی سێکــسی زیانــەکانی بەئــەوەوە دەست دەدەن.

سەرچاوەی زۆرێك لە تاوانە سێکسیەکانیش لەم گروپەی بەکارهێنەرانی هەمان مەوادە.
ئەم مادە لەنێو هونەرمەندانی ڕۆژئاوایی بەتایبەت موزیکژەنەکان (جاز و راك) خۆشەویستیەکی زیادی هەیە.

سەرەکیترین کاریگەری تێکدەری حەشیش هاندانی تێکچون و گۆڕانەکانی نەخۆش جۆرێکە لە بەهاکانی ڕەوشتی کەسەکە.

بەکارهێنانی زیادی ئەم مادەیە نیشانەکانی هاوشێوەی شێتی دروست دەکات. لەم حاڵەتەدا نەخۆش حاڵەتی هێرشبەری و شەرنگێزی توندی هەیە کە لە هەندێ لایەنەکاندا ئەنجامەکەی بە ئەنجامدانی تاوانی گەورە دەبێت.

سەرەڕای ئەوەش لایەنەکانی دەرونیش باسکراوە، تێکچونەکانی جەستەیی و فیسیۆلۆجیش کاریگەریەکانیەتی لەسەر کەسەکە و نەخۆش وزەی نیش و ژیان لە دەست دەدات و بە نزیکەیی دەستی بۆ هیچ چالاکیەك لێ نادات، نەخۆش توشی لاوازی و نەخۆشی (Cashexia) دەبێت و سەرئەنجام لەماوەی ئەم نارەتییە جەستەییانەدا حاڵەتەکانی فەرامۆشکردن و بێ دەنگی و شڵەژاوی دروست دەکات.

**مێسکالین:** mescaline

جۆرێکی ئەلکالۆیدی ژەهریە کە لە یەك جۆر کاکتۆسی مەکسیکیەوە بە دەست دێت بەکارهێنانی ئەم مادەیە هۆی دروستبوونی وەهم و خەیاڵ لە لایەنی دەنگەکان و زەنگەکاندا دەبێت. ژەهراویبوون بەهۆی بەکارهێنانی مەسکالین مەسکالینیسمی پێ دەوترێت.

**ئێل ئێس دی:**LSD

تێکەڵێکە لە ئێرگۆ (کەڕوویەکە کە مشەخۆری گیای چاودار) وەرگیراوە و کاریگەریەکانی زۆربوونی خەیاڵ و واتە وڕێنەهێنەر دەبێت.

ئەم مادەیە لە ساڵەکانی کۆتایی لە ڕۆئاوا ڕەواجی زیاتری پەیداکردووە و بەهۆی هەرزانبوونی و ئاسان دەستکەوتنی و دروستکردنی، ڕۆژ بە ڕۆژ بەکارهێنانی زیاتر دەبێت.

ئەم مادە هەتا لەو ناوەندانەی ئەو کەسانەش دروستی دەکەن کونکراوە. ئێل ئێس دی مادەیەکی وڕێنەهێنەرە و کە هۆی تێکچونی دەرکپێکردنی بینایی و بیستنی دەبێت و لاوازی و خەوە بەرزە فڕەکان لە کەسەکەدا دروست دەکات.

تـەوەهومی بینـایی بەشـێوەی ڕەنگـە زۆر جـوان و هەمەچەشـنەکان و هاندەرەکانـە و تەوەهومەکانی بیستنیش لە حەدی بیستنی دەنگەکان و مۆشیقای کێشدار و گـوێگر جیلـوە دەکات. لە ئەم جۆرە لایەنانەدا کەسەکە بۆ کرداری شـێتی ئـامێز دەسـت لـێ دەدات، بـە توندی بە قەصدی، یان بە دەنگە بەرزکان پێدەکەنێت کە ئەمـە خـۆی بـەهۆی دەرککردنـی هەڵەوە بە دەست دێن، جەستەکانی و ڕەنگە خەیاڵییـەکان لـە فـەزادان. ئـەم حاڵەتـە (زۆر چالاکانە) تا ماوەی یەك سەعات بە درێژی ئەنجام دەدرێت و سەرئەنجام پاش لـەوە شـەلەل و سستی بە کەسەکە دەدات و دەیخەوێنێ.

ئەم حاڵەتانە تەوەهومی هەندێك جار تا چەند ڕۆژێك بەردەوام دەبێت (پەیوەستە بـە بـڕی بەکارهێنانەوە).

ئێلْ ئێس دی یەکێك لە ترسـناکترینی جۆرەکانی مادە بێهۆشکەرەکانە، کە لە زۆرێـك لـە لایەنەکان هۆی شەڕانگێزی توند و دژوەستان بەهۆی تێکچوون دەبێت لە دەرکپێکردندا.

## بەشی دووەم

# هەندێ نەخۆشی باو

## هەوكردنی كیسەی زراو:

زۆربەی نەخۆشیەكە لە ئافرەتدایە نەك لە پیاو، ئافرەتەكە لەوانەیە قەڵەو بێت.بەخواردانی تێك دەچێت و قرقێنە و هێڵنجدانی هەیە، لەبەرئەوەی زراو هەرسی چەوری دەكات. ٩٠٪ زیاتری ئەو نەخۆشانەی بەهۆی بەردی زراوەوەیە. خۆشبەختانە نیوەی ئەو كەسانەی بەردی زراویان هەیە هیچ نارەحەتیەكیان نیە. بۆیە ئەمانە پێویستیان بە نەشتەرگەری نیە. ئەوانەی توشی ژانە سك دێن



ئەڵێن ژانەكەی لە ئازاری گوللە یان لە قاچ شكان یان لە منداڵبوون زیاترە. ئەگەر دەست بدرێت لەلای ڕاستی سكی نەخۆش واتە ژێر پەراسووی لای ڕاست، یەكسەر نەخۆشەكە هاوار دەكات، ئەگەر پێی بڵێی هەناسە بدە، كاتی دەست لێدان واتە ناتوانێت هەناسەكە تەواو بكات. دوای چارەسەری سەرەتایی و بەكارهێنانی دەرمانێكی دژەئازاری گونجاو، نەخۆشەكە بنێرن بۆ نەخۆشخانە.

## هەوكردنی پەنكریاسی كورتخایەن:



ئەم ئازارە زۆر قورس و سەختە و نەخۆشەكە دەچەمێنێتەوە. زۆربەی كات ڕشانەوە و هێڵنجدانی لەگەڵە، زۆرەبەیان ناتەواویان هەیە لە ڕێڕەوی زراودا و باشتر وایە ڕەوانەی نەخۆشخانە بكرێن. ئەگەر توانرا فلۆیدی بۆ هەڵبواسرێت تا دەگاتە نەخۆشخانە.

## هەوكردنی گورچیلە و میزەڵدان:

جگە لە میزەچورکێ و ئازاری کەلەکە و میزەڵدان نەخۆشەکە لەرز و تای هەیە.

چارەسەر:



١-ئامۆژگاری نەخۆشەکە بکرێت و ئاو و شلەمەنی زۆر بخواتەوە. ٢-دەرمانی دژەئازار و دژەتا بەکاربێنێت. ٣-ئەنتی بایۆتیك وەك کەپسولی ئەمۆکسیسیلین ٥٠٠ میلی گرەم یان کۆتریمۆکسازۆڵ حەبی گەورەکان بۆ ماوەی ٧ تا ١٠ ڕۆژ، بەڵام کۆتریمۆکسازۆڵ نەبێت ئاوی زۆری لەگەڵ بەکاربێت ئەگینا بەردی کریستاڵی گورچیلە دروست دەکات. ٤-ئەگەر نەخۆشەکە یەکەم جار بوو دەستنیشان بکرێت پێویستە ڕەوانەی نەخۆشخانە بکرێت بۆ پشکنینی زیاتر.

## گرژبوونی کۆلۆن: Irritable bowel syndrome

بڵاوترین نەخۆشی کۆئەندامی هەرسە و لە ٣٠٪ خەڵکی توشی دەبن، بەتایبەتی لە شارەکاندا. ئەو نەخۆشە هەندێك جار قەبزە و پیسایەکەی وەك پشقل وایە و هەندێك جار سکی دەچێت، بەتایبەت بەیانیان دوای نان خواردن.






قۆڕەقۆڕی سك یان باویژەی زۆرە و بەخۆراکی توێکڵداری وەك نۆك و نیسك و فاصۆلیا و سەوزە با دەکات. زۆربەی ئەو کەسانە پەشێوی دەروونیان هەیە. نەخۆشیەکەیان مەترسی نیە، زۆربەی ئەو نەخۆشانە سەردانی زۆر پزیشکیان کردووە و جۆرەها پشکنینیان بۆ کراوە. هەندێك جار نەشتەرگەری لابردنی زراو یان ڕیخۆڵە کوێرەیان بۆ کراوە.

## هەوكردنی ریخۆڵەی درێژخایەن:

دوو جۆری سەرەكی لەم نەخۆشیە هەیە هەوكردنی خۆرەیی كۆڵۆن Ulcerative colitis و نەخۆشی كرۆن Crohn's disease یان بەشێوەی سكچون یان سكچونی خوێناوی درێژخایەن دەردەكەون هەیە. نەخۆشی كرۆن زیاتر ئازاری لای ناوكیان هەیە.



## بەردی گورچیلەو بۆری میز:

ڕێژەیەكی زۆر خەڵكی لای خۆمان بەردی گورچیلەی هەیە، هەركاتێك بەردەكە بۆناو بۆری میز جوڵەی كرد، ئەو كاتە نەخۆشە توشی ئازارێكی زۆری گورچیلە یان ڕاستر بڵێین توشی ژانی بۆری میز دەبێت. هەندێك كات نەخۆشەكە ئازاری نیە بەڵام لەوانەیە زوو زوو توشی میزەچوركێ و هەوكردنی بۆری میز بێت و ڕەنگی میزەكەی بگۆڕێت. لەوانەیە نەخۆشەكە پێش ئەو نۆرە ئازارە بەردی فڕێدابێت یان نەشتەرگەری بۆ كرابێت.




چارەسەر:

١-دەرزی ئازار بە سمت. ٢-ئەگەر ڕشانەوەی زۆربوو فلۆیدی بۆ هەڵدەواسرێت، پاشان نەخۆشەكە ڕەوانەی نەخۆشخانە بكرێت بۆ ئەوەی پشكنینی پێویستی بۆ بكرێت.

## بەڵغەمی خوێناوی: Haemoptysis

پێویستە یەك لای بكەینەوە سەرچاوەی خوێنەكە كۆكەیە نەك ڕشانەوە یان خوێنبەربوونی لووت، هەركاتێك نەخۆش بەڵغەمی خوێناوی هەبوو ڕەوانەی نەخۆشخانەی بكە.



هۆیەكانی:

نەخۆشیەكانی سنگ: سیلی سی، شێرپەنجەی بۆریەكانی هەوا، هەوكردنی كورتخایەنی سی

(Pneumonia)، جەڵتەی سیەکان، هەوکردنی سەخت یان درێژخایەنی بۆریەکانی هەوا، داخوران و فراوانبوونی بۆریەکانی هەوا(Bronchectasis).

نەخۆشیەکانی دڵ: تەسکبونەوەی زمانەی دوانی (Mitral stenosis).

نەخۆشیەکانی خوێن: شێرپەنجەی خوێن(Leukaemia).

هەندێ لەو حەپلانەی مەیینی خوێن کەم دەکەنەوە.

## هێڵنجدان و ڕشانەوە: Nausea and Vomitting



هێڵنجدان واتە نارەزووکردنی رشانەوە یان دڵ پری، کە لەوانەیە بە هێڵنج دەست پێ بکات، بریتی یە لە خاڵی کردنەوە یان هێنانەوەی خواردەمەنی ناو گەدە لەڕێی دەمەوە. ڕشانەوە کارێکە کە لە دەست خۆماندا نیە، لەئنجامی گرژبوونی ماسولکەکانی سك و نتوپەنچکەوەیە. کە دەبێتەهۆی کرانەوەی زمانەی نێوان گەدە و سورێنچك و بەخێرایی دەرپەڕینی خواردنەکە بۆ دەرەوە.

هۆیەکانی:

١-نەخۆشیەکانی کۆئەندامی هەرس: هەوکردنی گەدە و ریخۆڵەکان، کولکی گەدە و دوانزەگرێ،گیرانی ریخۆڵە، ژەهراویبونی خۆراکی..هتد. ٢-دەرمان: دیجۆکسین، ئەلکهول (مەی). ٣-هۆی دیکە: سکپڕی، سستبونی دڵ جەڵتەی دڵ سستبونی گورچیلە، ژانی گورچیلە و بۆری میز، زۆربەی درمەکان لە منداڵدا.

هۆکانی کۆئەندامی دەمار: شەقیقە، هەوکردنی گوێی ناوەوە، گرێ یان وەرەمی ناو مێشك.

## گیرانی دەرچەی گەدە: Pyloric stenosis




ئەم نەخۆشانە زۆربەی کات کولکی گەدە یان دوانزەگرێیان بووە، پێیان زانیبێت یان نا. پاش ماوەیەك لە هەوکردنی دوبارەبوەوە، دەرچەی گەدە تەسك دەبێتەوە. نەخۆش ڕشانەوەی بەردەوامی هەیەکە خواردنی بۆگەنبوی چەند ڕۆژ لەوەو پێشی تێدایە، پاش

ماوەیەك نەخۆشەكە كێشی كەم دەكات و لاواز دەبێت. زۆربەی كات پێویستیان بە نەشتەرگەری هەیە. پێویستە ئەو نەخۆشانە ڕەوانە بكرێن. ئەگەر ڕێگای دووربوو پێش ئەوە فلۆید (رینگەر یان سەلاین)یان بۆ هەلبواسرێت.

## هەوكردنی گەدە و ریخۆڵە: Gastroenteritis




نەخۆشیەكە لە پڕ دەست پێ دەكات و سەرەڕای ئازار و پێچی ناوسك، سكچوون و ڕشانەوەشی هەیە، زۆربەی ئەو نەخۆشانە بەماوەیەكی كورت چاك دەبن و پێویستیان بە ڕەوانەكردن نیە، ئەگەر سكچونەكەزۆری خایاند و نەخۆشەكە نەیتوانی بەباشی شلەمەنی بخواتەوە، ئەو كاتە پێویستی بە فلۆید دەبێت لەرێگەی خوێنهێنەرەوە.

## گیرانی ریخۆڵە: Intestinal obstruction




جگەلە ڕشانەوە و سكچون، نەخۆشەكە زۆر قەبزە و پیسایی ناكات. سك ئێشەی دەم دەمی هەیە لە شێوەی ئازارێكی زۆر وەكو پێچ وایە، هەروەها سكی دەئاوسێت و وردە وردە بۆنی ڕشانەوەكەی ناخۆشتر دەبێت. باشتر وایە دوای دانانی فلۆید لەرێگەی خوێنهێنەرەوە ڕەوانەی نەخۆشخانە بكرێت.

## هەوكردنی پەردەكانی مێشك: Meningitis

ڕشانەوە، سەرئێشە، تا، لەگەڵ تێكچونی ڕادەی هۆش لە نیشانە سەرەكیەكانی هەوكردنی پەردەكانی مێشكن. لەوانەیە ملی ڕەق بێت و نەخۆشەكە نەتوانێت بەدەست سەری بە ئاسانی بۆ پێشەوە و دواوە بجولێنێت. ئەگەر نەخۆشێك یەكێك لەم نیشانانەی هەبوو (Neck rigidity) باشتر وایە بە زوترین كات ڕەوانەی نەخۆشخانە بكرێت. ئەگەر نەخۆشكە تای بەرزی هەبوو، باشتروایە فێنك بكرێتەوە و پێش ڕەوانە كردن باشتر وایە حەبی پاراسیتامۆڵ یان ئەسپرینی بدرێتێ.



## ئاوی ڕەشی چاو: Glaucoma

ئاوی ڕەشی چاو دوو جۆرە: ١-تیژ. ٢-بەردەوام.

هەندێك جار چاوی کزدەبێت و سوردەبێتەوە و لایەکی سەری دێشێت، بەهۆی بەرزبونەوەی پەستانی ناوەوەی چاویەوە، لە هەمان کاتدا لەوانەیە نەخۆشەکە ڕشانەوەی هەبێت. ئەگەر لەگەڵ ڕشانەوە کاندا نەخۆشەکە چاوی کزبوبوو وە نیشانەی ئاوی ڕەشی هەبوو، پێویستە بۆلای پزیشکی تایبەت و پسپۆڕ ببرێت.



## شەقیقە: Migrain

زۆربەی ئەو نەخۆشانە ئافرەتن، سەرئێشەکەیان ٤ تا ٤٨ کاتژمێر دەخایەنێت. بەتاریکی و بێ دەنگی ئازاریان کەم دەبێتەوە و لەوانەیە ڕشانەوەیان هەبێت. نەخۆشەکە لایەکی سەری دێشێت و دەرشێتەوە. هەموو جارێك نەخۆشەکە ناچار دەبێت لە جێگەدا بکەوێت.لەوانەیە یەکێك لە ئەندامانی خێزان یان خزمێکی نزیکی نەخۆشەکە هەمان نەخۆشی هەبێت پێش دەستپێکردنی نۆرە ئازارەکە لەوانەیە نەخۆشەکە هەستی پێ بکات بەوەی دڵی پڕ دەبێت چاوی ڕەشکە و پێشکە دەکات و وێنەی جۆراوجۆری تیشك دێتە بەرچاوی. ئەگەر نەخۆشەکە پێشتر زانیاری دەربارەی نەخۆشیەکەی نەبوو، باشتروایە ڕەوانەی نەخۆشخانە بکرێت.




## هەوکردنی تیژی ڕیخۆڵە کوێرە: Acute Appendicitis

ئەم ئازارە لەدەوروبەری ناوکەوە دەست پێدەکات و دوای چەند کاتژمێرێك دەچێتە بەشی خوارەوەی لای ڕاستی سك. بە دەست لێدانی شوێنەکە ئازارەکە زیاد دەکات، کاتێك بەخێرایی دەستت هەڵدەگریت نەخۆشەکە ئازارەکەی زیاتر دەبێت. ئەگەر زوو دەستیشان نەکرێت و ڕەوانە نەکرێت لەوانەیە



ریخۆڵەکە کون بێت و ببێتەهۆی کونبونی پەردەی پریتۆنیۆم: لە نیشانەکانی دیکەی ریخۆڵە کوێرە: نەمانی حەز بۆ خواردن، قەبزی و تام کەم.

## هەوکردنی گورچیلە: Acute pyelonephritis

ئەم نەخۆشیە لە مێینەدا زۆرترە، نەخۆشەکە لەرزو تای هەیە، میزی بە سەختی بۆ دەکرێت رەنگی میزی گۆڕاوەو ئازاری کەلەکەی هەیە، بەدەست لێدانی کەلەکەیان ئازاریان زۆرتر دەبێت.



چارەسەر:

١-پشوودان. ٢-خواردنەوەی ئاو و شلەمەنی زۆر. ٣-ئەگەر تای بەرزبوو فێنك بکرێتەوە و دەرمانی دژەتا بخوات. ٤-ئەگەر رشانەوەی زۆر و بەردەوامی هەبوو لەوانەیە پێویستی بە فلۆید هەبێت لەرێگەی خوێنهێنەرەوە. ٥-پێویستی بە دژە ئازار هەیە بەشێوەی شاف یان دەرزی یان حەب. ٦-رەوانە بکرێت بۆ نەخۆشخانە بۆ چارەسەرکردن و پشکنینی زیاتر بەتایبەت ئەگەر نەخۆشیەکە دوبارەبوەوە.

## تەسکبونەوەی دریژخایەنی بۆرییەکانی هەوا:

## Chronic obstructive airway disease

ئەم نەخۆشیە لە پیاو و ژنی بەتەمەن و جگەرەکێشەکاندا زۆرە، نەخۆش رەنگی رەشتاڵەیە) و لەوانەیە خوێنی زۆر بێت. سەرپەنجەکانی دەست و قاچ و سەری زمان و لێوی شین هەڵگەڕابێت. زۆربەیان زستانان کۆکە و بەڵغەمیان هەیە (واتە هەوکردنی دریژخایەنی بۆرییەکانی هەوایان هەیە). جار جار هەردوو لاقیان دەئاوسێت کەنیشانەی سستبوونی دڵە (نەخۆشی سستبونی دڵ بەهۆی هەوکردنی




دریژخایەنی بۆری هەناسەوە (Cor-pulmonale). هەندێك لەم نەخۆشانە کە زیاتر کۆکەیان هەیە و زۆر تەنگەنەفەسن بەڵام بەڵغەمیان نیە و شین هەڵناگەڕێن و نائاوسێن و لاوازن، ئەوانە سیەکانیان هەڵکفاوە یان فراوانبووە (پڕبوونی سی لە هەوا (Emphysema) قەفەزەی سنگیان وەك بەرمیل وایە.

چارەسەر:

-ئامۆژگاری نەخۆشەکە بکە واز لە جگەرە بهێنێ و ئەگەر ناتوانێت کەمی بکاتەوە. -دەرمانی فراوانکەری بۆری هەوا بەکاربهێنێت. -لەکاتی نۆرەیەکی تەنگەنەفەسی بەهێزدا ئەمپولی دەرمانی فراوانکەری بۆری هەوا بەکاربهێنە ئەگەر هەبوو لەگەڵ ئۆکسجیندا. -ئەگەر نیشانەی هەوکردنی سەختی هەبوو وەك گۆڕانی ڕەنگی بەڵغەم و تا و کەم هێزی، ئەوا ئەنتی بایۆتیکی بدەرێ. -ڕەوانە بکرێت بۆ نەخۆشخانە ئەگەر:

-نەخۆشەکە نەتوانێت پاڵ بکەوێت یان پشوو بدات.

-شین هەڵگەڕانی لێو و سەری زمان و سەرپەنجەکانی دەست و قاچ.

-تای بەرز لە ٣٩ پلەی سەدی زیاتر بێت و لە سێ ڕۆژ زیاتر بخایەنێت.

## ڕەبۆ: Asthma

زۆربەی ئەو نەخۆشانە پێشتر نەخۆشیەکانیان دەست نیشانکراوە و لەوانەیە دەفتەری نەخۆشیە درێژخایەنەکانیان هەبێت. ئەم نەخۆشانە دەم دەم توشی تەنگەنەفەسی، خیزەی سنگ و وشکە کۆکە دەبن.



-ئەگەر جگەرەکێش بوون، ئامۆژگاریان بکە واز لە جگەرە بهێنن.

-خۆیان لە تۆز و خۆڵ و گوڵ و گیا و هەوای پیس و دوکەڵ بپارێزن. -هەروەها بۆ ئافرەت، گسکدان زیانبەخشە. -ئاو و شلەمەنی زۆر بخۆنەوە.

-بەخاخ (پەمپ) لەکاتی تەنگەنەفەسی و خۆپاراستن بەکاربهێنن.

-بۆ چارەسەرکردنی نۆرەیەکی تەنگەنەفەسی سەخت (Acute attack):

١-هەڵمژینی هەڵمی ئاوی گەرم.

٢-ڕەوانەکردن بۆ نەخۆشخانە.

## تەنگەنەفەسی دەرونی:Hyperventilation syndrome

زۆربەی نەخۆشەکان گەنجن بەتایبەت مێینەن، نەخۆشەکە بەخێرایی هەناسە دەدات بەڵام وا هەست دەکات کە سنگی پڕ نابێت لە هەوا، قاچ و دەستیان ساردە و ئارەقی سارد دەکەنەوە. لێویان سڕ دەبێت. خیزەی سنگیان نیە و هیچ شوێنێکیان شین نابێتەوە، سەریان قورسە و هەناسەدانیان قوڵە و هەوا بە ئاسانی دەچێتە سیەکانەوە. زۆربەیان پێشتر جارێك یان زیاتر ئەم بارەیان (Chronic hyperventilation) بەسەر هاتوە. لێدانی دڵیان خێرایە بەڵام پەستانی خوێنیان ئاسایە.




-نەخۆشەکە و کەس وکاری دڵنیا بکەرەوە کە نەخۆشیەکە مەترسی نیە.

-هەندێك جار نەخۆشەکە بەهۆی هەناسەدانی خێراوە دەست و پێی گرژ دەبێت (خوار دەست (Carpopedal spasm)) یارمەتی نەخۆشەکە بدە کە لە کیسەیەکی نایلۆندا هەناسە بدات هەتا ئاسایی دەبێتەوە.

## هەوکردنی کورتخایەنی بۆریەکانی هەوا:

Acute bronchitis



ئەم نەخۆشی یە لەوانەیە یەکەم جاری بێت توشی ئەم بارە بێت. نەخۆشەکە تەنگەنەفەس دەبێت، کەمێك خیزەی سنگ، کۆکە و بەڵغەم و تای هەیە. بۆ ئەم نەخۆشیە پێویست ناکات هەموو جارێك نەخۆشەکە ڕەوانەی نەخۆشخانە بکرێت.

چارەسەر:

-ئاو و شلەمەنی زۆر بخواتەوە.

-ئەنتی بایۆتیك بۆ ماوەی ٧ تا ١٠ ڕۆژ.

-لەکاتی هەوکردنی سەختدا، جاری وا هەیە بەڵغەمەکە کەمێك خوێنی پێوەیە، ئەگەر زۆری خایاند و نەخۆشەکە بێ هێز بوو ڕەوانەی بکە.

## ئاوبەندی سییەکان: Pulmonary oedema

زۆربەی کات بەهۆی سستبونی کتوپڕی دڵەوەیە، بەتایبەت لەو نەخۆشانەدا کە ماوەیەکی زۆرە فشاری خوێنیان بەرزە و چارەسەری وەکو پێویست بەکارناهێنن یان دوای جەڵتەی دڵ ئەگەر کارمەنی تەندروستی توانی ئەم بارە دەست نیشان بکات، ئەوا پێش ئەوەی نەخۆشەکە ڕەوانە بکات، دەتوانێت ئەم چارەسەری بۆ بکات:



١-نەخۆشەکە دابنیشێت یان پشتی بەرز بێت و پاڵنەخرێت.

٢-ئەگەر ئۆکسجین هەبوو، ئەوا بە بەردەوامی لەڕێگەی ماسکەوە بیدەرێ.

## سیلی سی (دەردە باریکە): Pulmonary TB



هەر نەخۆشێك لە ٣ هەفتە زیاتر کۆکەی هەبوو یان کۆکەکەی خوێنی پێوەبوو، پێویستە بیر لە نەخۆشی سیل بکرێتەوە بەتایبەتی ئەگەر پێشتر توشی ئەم نەخۆشیە بووبێت، یان یەکێکی نزیکی ئەو کەسە نەخۆشیەکەی هەبوو. نیشانەکانی دیکە بریتین لە ئارەقکردنەوە، شەوانە لەناو جێگادا، بێ هێزی و دابەزینی کێش، کەمبونەوەی خواردن. هەرکەسێك لە ٣ هەفتە زیاتر کۆکەی هەبوو ڕەوانەی نەخۆشخانەی بکە بۆ ئەوەی پشکنینی تایبەتی بە تیشکی ئێکس و پشکنینی بەڵغەمی بۆ بکرێت بۆ بەکتریای چیلکەیی سیل. ( Sputum analysis for acid fast bacilli AFB).



## کەمخوێنی: Anaemia

هەر کاتێك ڕێژەی خوێن هاتە خوارەوە بۆ ژێر ٦٠٪ یان کەمتر لە ٥٠٪ی باری ئاسایی ئەوا نەخۆش هەست بە تەنگەنەفەسی دەکات، لەسەرەتادا لەکاتی ڕۆیشتن و کاردا، دواتر ئەگەر کەمخوێنیەکە سەختتر بێت لە

هەموو بارێکدا نەخۆشەکە هەست بە بێ هێزی و ماندووبوون دەکات. نیشانەکانی دیکەی کەمخوێنی بریتین لە سەرسوڕان، کەم خواردن، دڵەکوتێ، بێ ڕەنگی پێست و زمان و ناوپۆشی دەم، بێ ڕەنگی دیوی ناوەوەی پێڵوی چاو (Conjunctiva) باشتر وایە هەرنەخۆشێك هۆی کەمخوێنیەکەی نەزانرابوو ڕەوانەی پزیشکی تایبەت بکرێت بۆ دۆزینەوەی هۆیەکەی، بەهیچ شێوەیەك نابێت بێ سەرپەرشتی پزیشك خوێن بکرێتە نەخۆشەوە، تەنها لەکاتی کتوپڕی و زۆر پێویستدا نەبێت. زۆربەی ئەوانەی لە وڵاتی ئێمەدا توشی کەمخوێنی دەبن ئافرەتن. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ گرنگی نەدان بە خۆراکی باش و کاری بەردەوام و پشووی کەم. هەندێك جار کەمخوێنی بەهۆی خوێن لێڕۆیشتنی درێژخایەن وەکو ئەو ئافرەتانەی سوڕی مانگانەیان نارێکە یان ئەو کەسانەی مایەسیریان هەیە ڕوودەدات.

## پەککەوتن یان سستبونی دڵ: Heart failure

نەخۆشیەکی زۆر باوە، هەموو جۆرە نەخۆشیەکی دڵ لەوانەیە ببێتەهۆی سستبونی دڵ لە هۆیە سەرەکیەکانی نەخۆشی سستبونی دڵ نەخۆشی بەرزبونەوەی پەستانی خوێنە، و نەخۆشی تەسکبونەوەی خوێنبەرە تاجیەکانی دڵ (Ischaemic heart disease)، هەندێك جار سستبوونی دڵ لەئەنجامی نەخۆشی درێژخایەنی سنگەوە ڕوودەدات وەکو (هەوکردنی درێژخایەنی بۆریەکانی هەناسە) ( Chronic obstructive airway disease) لەسەرەتای نەخۆشیەکەدا نەخۆشەکە تەنها بە کارکردن یان بە ڕۆیشتن تەنگەنەفەس دەبێت، دواتر کۆکەیەکی بەردەوامیان توش دەبێت و قاچیان دەئاوسێت و فشاری ناو خوێنهێنەرەکانی ملیان بەرزدەبێتەوە (Congestive heart failure) شەوانە ناتوانن لەسەر جێگا تەخت پاڵبکەون و لەکاتی خەودا




بەهۆی تەنگەنەفەسیەوە خەبەریان دەبێتەوە. بۆ پاڵکەوتن زیاد لە سەرینێك یان پشتیەك دەخەنە ژێر سەر و پشتیان. زۆربەی ئەو کەسانە یان پەستانی خوێنیان بەرزە، یان نەخۆشی خوێنبەرە تاجیەکانیان هەیە (Ischaemic heart disease) پێویستە ئەم نەخۆشانە ڕەوانەی پزیشکی پسپۆڕ بکرێن.

## تەسکبونەوەی خوێنبەرە تاجیەکان: Coronary heart disease




ئەم نەخۆشە لەو کەسانەدا ڕوودەدات کە تەمەنیان لەسەروی ٤٠ ساڵیەوەیە.

هۆکارە مەترسیدارەکان:

-جگەرەکێشان. -خۆراکی چەور (چەوری ئاژەڵ). -بەرزبونەوەی ڕێژەی کۆلیسترۆل لە خوێندا کە (هایپەرکۆلیسترۆمیا)یە. -نەخۆشی شەکرە و بەرزی پەستانی خوێن.-هەڵکەوتەی خێزانی (Family predisposition).

ئەم نەخۆشیە لە ئەنجامی تەسکبونەوەی ئەو خوێنبەرانە ڕوودەدات کە خوێن بۆ ماسولکەی دڵ دەبەن، لەئەنجامدا دڵبڕی پێویس ئۆکسجینی بۆ ناچێت و دەبێتەهۆی ئازاری سنگ لەکاتی ئیشکردن و ماندووبوندا (سنگەکوژێ (Angina pectoris).

هەندێك جار گیرانی یەکێك لە خوێنبەرە سەرەکیەکان دەبێتەهۆی زیانگەیاندنی زۆر بە ماسولکەی دڵ و لەئەنجامدا جەڵتەی دڵ (Myocardial infarction) ڕوودەدات.

## کۆکە: Cough

لای زۆربەی خەڵکی کۆکە تەنها سەرما و هەڵامەت دەگەیەنێت، کە تا ڕادەیەك ئەمە ڕاستە، بەڵام کۆکە (بەتایبەت کۆکەی درێژخایەن)، لەوانەیە بەهۆی نەخۆشیەکی درێژخایەن و هەندێکجار ترسناکەوە دەبێت.

هۆیەکانی کۆکە:

-نەخۆشیەکانی کۆئەندامی هەناسە: وەك هەوکردنی تیژی بەشی سەرەوەی کۆئەندامی هەناسە (Acute respiratory tract infection)، ڕەبۆ، هەوکردنی درێژخایەنی بۆریەکانی هەناسە ( Chronic bronchitis)، جگەرە کێشانی درێژخایەن، سیل، شێرپەنجەی سی...هتد.




-نەخۆشیەکانی دڵ و سوڕی خوێن: سستبونی دڵ

(Heart failure)، سورێژە، کۆکەڕەشە، دڕکەومێکوتە، هەلاّمەت..هتد.

-دومەڵی سی:**Lung abscess**

ئەگەر هەوکردنی سیەکان زۆری خایاند توشی هەوکردنێکی قورس هات ئەوا مەترسی دروستبونی دومەڵی هەیە. نەخۆشەکە بەردەوام کۆکەی دەبێت و وردە وردە بەرەو لاوازی دەچێت , لەوانەیە گۆشەی نێوان شوێنی بەیەکەوەلکانی نینۆك و پەنجەی دەست نەمێنێت (Finger clubbing) پێویستە بۆ چارەسەری نەخۆشکە فیلمی تیشکی سنگی بۆ بگیرێت.

-داخورانی بۆریەکانی هەناسە:**Bronchectasis**

هەر کاتێك نەخۆش بەڵغەمی هەبێت، دەبێت بزانیت بڕی بەڵغەمەکەی چەندە، ئەگەر زۆر بوو یان بە خەملاّندن لە پەرداخێك زیاتر بوو لە ڕۆژێکدا ئەوا مەترسی ئەم نەخۆشیە هەیە. لەم بارەدا فیلمی تیشکی سنگ (X-Ray) نەخۆشیەکە دەردەخات. دەبێت نەخۆشەکە ئامۆژگاری بکرێت بۆ ئەوەی بەڵغەمەکەی فڕی بداتە دەرەوە بە یارمەتی یەکێکی دیکە، بەپێی شوێنی فراوانبوونی دەبێت نەخۆشکە پاڵ بکەوێت و یەکێکی دیکە لە پشتی بدات و خۆیشی لە هەمان کاتدا بکۆکێت. باشتر وایە نەخۆشەکە شلەمەنی زۆر بخواتەوەئەگەر ڕەنگی بەڵغەمەکەی گۆڕا بۆ زەرد یان سەوز پێویستە ڕەوانە بکرێت بۆ نەخۆشخانە.

## ئازاری سنگ: Chest pain

مەبەست لە سنگ ناوچەی خوار هەردوو ئێسکی چەڵەمە و پەراسووەکانە لەپێشەوە و لەدواوە تا ئاستی بڕبڕەی پشتی ژمارە ١٢ یە. هەر ئازارێك لەم ناوچەیەدا هەبێت پێی دەوترێت ئازاری سنگ.



-نەخۆشیەکانی دڵ: سنگەکوژێ (Angina pectoris). جەڵتەی دڵ هەوکردنی پەردەی دڵ (Pericarditis).

-کۆئەندامی هەناسە: وەك هەوکردنی سی، هەوکردنی پەردەی سی (Pleurisy)، کونبوونی پەردەی سی (Pneumothorax)، جەڵتەی سیەکان

(Pulmonary infarction).

-کۆئەندامی هەرس: هەوکردنی سورێنچك، ڕەقبوونی سورێنچك، برینی گەدە و دوانزەگرێ.

-نەخۆشیەکانی دیکە وەك شکانی پەراسوو، نەخۆشی دەمارەکان (Intercostal neuritis) بەتایبەت دەمارەکانی نێوان پەراسووەکان، ئازاری دەرونی یان واهیمەی نەخۆشی دڵ (Neurotic chest pain).

نەخۆشیەکانی مەمك: وەك شیر تێزانی مەمك (Breast engorgement) و دومەڵی مەمك، هەوکردنی مەمك (Mastitis).

-دەشێت ئازاری سنگ سەرچاوەکەی لە دەرەوەی سنگەوە بێت (ئازاری گواستراوە) بۆ نمونە لە ملەوە وەك سوڕانی بڕبڕەکانی مل یان لە سکەوە وەك ئازاری هەوکردنی زراو، ژانی بۆری زراو، ئازاری ماسولکەکانی سنگ بەهۆی ڕەقبونەوە.

## سنگەکوژێ: Angina pectoris

ئازارێکە لە ناوەڕاستی سنگدا هەستی پێ دەکرێت، زۆرجار ئازارەکە بەرەو شانی چەپ قۆڵ و دەستی چەپ و مل و ناوشان و شەویلاگەی خوارەوە دەگوازرێتەوە. ئەم ئازارە زیاتر لەکاتی ماندوبوندا بۆ نەخۆشەکە دێت و لە ٢ بۆ ١٠ خولەك دەخایەنێت و بەپشودان و حەبی ئەنجیسید نامێنێت.



-با نەخۆش خۆی ماندوو نەکات، شتی قورس هەڵنەگرێت، کاری قورس نەکات و هەمیشە حەبی ئەنجیسیدی پێ بێت.

-ئەگەر قەڵەو بوو خۆی لاواز بکات و واز لە جگەرەکێشان بهێنێت.

-لەکاتی نۆرە ئازاردا، نەخۆشەکە حەبی ئەنجیسید بخاتە ژێرزمانی، ئەگەر باش نەبوو دەتوانێت هەر ٥ خولەك جارێك یەك حەب بەکاربهێنێت لەماوەی نیو سەعاتدا ٧ حەب بەکاربهێنێت.

-پەستانی خوێن بگرە، ئەگەر بەرزبوو ١ کەپسولی ئەدالات لـەژێر زمـانی بتەقێنـە. پـاش چارەکێ یان نیو سەعات پەستانی خوێنی بۆ بگرەوە.

-نەخۆشەکە ڕەوانەی نەخۆشخانە بکە.

## هەوکردنی پەردەی سی: Pleurisy




زۆربەی کات گەنج توشی ئەم نەخۆشی یـە دەبێـت و هیچ مەترسیەکی نیە و دوای ماوەیەك چاك دەبێتەوە، بەڵام هەندێك جار ئەو نەخۆشـە توشـی تەنگەنەفەسـی دەبێت و مەترسـی کۆبونـەوەی ئـاوی لـە پـەردەکانی سیدا هەیە. ئەم بارە بە پـشکنین بـە تیـشکی (X-Ray) دەستیشان دەکرێت. لە وڵاتی ئێمەدا هـۆی سـەرەکی ئەم نەخۆشیە سیلی سیەکانە (Pulmonary TB). لەبەرئەوە پێویستە زوو نەخۆشەکە ڕەوانەی پزیشکی پسپۆڕ بکرێت.

## ئازاری دیواری سنگ بەهۆی ڕەقبونی ماسولکەوە:

## Chest wall pain due to muscular spasm



هەنـــدێك جـــار ماســـولکەکانی دەوری قەفەزەی سـنگ و نێـوان پەراسـووەکان ڕەق دەبن و بە جوڵەی ناوقەد و یـان بـە پەسـتانی دەســت ئازارەکــەیان زیــاد دەکــات، ئەمــە لەکاتێکدا کە تەندروسـتی نەخۆشـەکە باشـە هیچ نەخۆشیەکی دیکەی نیـە بـە نەخۆشـەکە بڵێ کە ئـەم ئـازارە مەترسـی نیـە، هـەروەها حەبی دژەئازاری پێویستە بەپێی زانیاری دەربارەی نەخۆشـەکە، شـێلان یـان مەسـاج سـودی زۆرە.

## هەوکردنی سی: Pneumonia



دوای فریاکەوتنی سەرەتایی پێویست، ئەم نەخۆشانەی خوارەوە پێویستە ڕەوانەی نەخۆشخانە بکرێن:

١-کۆکە و بەڵغەمی خوێناوی.

٢-شینهەڵگەڕانی لێو و سەری زمان و سەرپەنجەکانی نەخۆش.

٣-تەنگەنەفەسیەك بێتەهۆی ئەوەی نەخۆشەکە نەتوانێت پاڵ بکەوێت یان پشوو بدات.

## جەڵتەی سی: Pulmonary infarction

زیاتر لەو کەسانەدا ڕوودەدات کە نەشتەرگەریان بۆ دەکرێت و دوای نەشتەرگەریەکە ناتوانن بجوڵێن و بۆ ماوەیەکی زۆر لەسەر جێگا دەمێنێتەوە، بەتایبەتی لە نەخۆشی بەتەمەندا و ئافرەتی سکپڕ و یان ئەوانەی نەشتەرگەری کلۆتی سمت یان پرۆستاتیان بۆ دەکرێت، ئەمەش دەبێتەهۆی مەیینی خوێن لە خوێنهێنەرەکانی قاچ و حەوزدا. چونکە ئەم نەخۆشانە دەبێت بە زووترین کات ڕەوانەی نەخۆشخانە بکرێن، چونکە ئەم نەخۆشانە پێویستیان بە دەرمانی دژی مەیینی خوێن هەیە. هەروەها چاودێری تایبەتیان پێویستە لەگەڵ نەجوڵان بۆ ماوەیەك و ئەنتی بایۆتیك بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ.



## جەڵتەی دڵ: Myocardial infarction



ئازارەکەی وەکو ئازاری سنگەکوژێ وایە لە شێوە و بڵاوبونەوەیدا، بەڵام سەختترە و لە ١٠ خولەك زیاتر دەخایەنێت و بە حەبی ئەنجیسید و پشوودان ناڕوات. نەخۆشەکە ئارەقە دەکاتەوە و هێڵنجدان و ڕشانەوەی هەیە، پێویستە ئەم نەخۆشە بە زووترین کات ڕەوانەی نەخۆشخانە بکرێت. باشترە ئەگەر پێش ڕەوانەکردنی ١ حەبی ئەسپرینی ١٠٠ میلی گرەمی بخوات.

# بەشی سێیەم

# خۆراکی تەندروست

## ڕۆڵی خۆراك

خواردن بە کۆمەڵە مەوادێك دەوترێت کـە پێکهاتـەی شـەکر (کاربۆهیـدرات) چـەوری (لیپید)، پرۆتین، خـوێ کانزاییـەکان و ڤیتامینەکانـە و بـۆ زینـدوبوون و ژیـانی خانـەکان و چالاکی داواکراوی ئەوان پێویستن. هیچ خۆراکێك بە تـەنیا هـەموو مـەوادە زەروورییـەکانی بواری پێویستی لـەشی تێدا نییە.

– ڕژێمە خۆراکییە تایبەتییەکان هەموو کێشـەکانی ئـەو کەسـانە کـە لـە ڕووی گەشـە و زیندوبوونی خانەکان و چالاکی کۆئەندامەکانی لەشـەوە دابـین نەکـەن. بـە عینـوانی نمونـە، ڕژێمی خالصی گیاخۆری داواکراوی هیچ زانایەك یان کتێبێکی زانستی نەبووە و یان لابردنی یەك تا چەند خواردن بەبێ دەرکەوتنی کاریگەرییەکانی نەویستراو بووە.

– سود وەرگرتن لە گۆشت، سەوزە، میوە، دانەوێڵە، بەرهەمەکانی دەریایی و شـیرەمەنی لە ژێر یەك بەرنامەی تایبەت ئەتوانن نیازە بنەڕەتیەکانی کەسەکە بهێننە دی.

– بەرنامەی خۆراکی گونجاو، ڕاسپاردەی بەرنامەیەکی پـڕ نـرخ و سـەنگین نییـە، بـەڵکو دەستورییە لەگەڵ یەك سەرچاوەی داواکراوی زانستی.

– تەنها بەڵگەی هەمەچەشنی مەوادی خۆراکی، نیازی کۆئەندامەکانی لەش نییە، بـەڵکو بەتامی خۆراك خواردنیشە. هەمەچەشنی لە ڕەنگ، تام، مـەزە و شـوێنەواری فیزیۆلـۆجیکی خۆراك لە لەشیشدا لە هۆکارەکانی دروستبوونی ئاوێزەیـەکی فـراوان دەبێـت لـە بەرنامـە خۆراکییەکان.

– کێشی ئاسایی کە دواتر ڕونکردنەوەی لەسەر دەدرێت، بابـەتی هـەبوونی بەرنامـە لـە خۆراکەکەدا کە پێکهاتەی لە ڕێژەی صەدی نزیکەیی بەکارهێنانی خۆراکەکە باس دەکـات، پێویست دەبێت.

– خۆراك لە گروپە جیاوازە تایبەتە گونجاوەکان خۆی داوای بکات.

## ژنانی سکپڕ:

١- بە بەرنامەکانی گونجاتر لەگەڵ پشتبەستن بە سود وەرگرتن لە شیر، کالسیۆم، ئاسن، ڕژێمە کەم خوێنەکان نیازیان هەیە.

٢- کالۆری: ژنانی چاوەڕوانکراوی سکپڕی بە ڕادەی ٣٠٠ کالۆری بۆ زیاد دەکرێت، کە بەپێی نیازی ڕۆژانە پێویستیانە. ئەم کالۆریە سنورداره بۆ گەشەی داواکراو و وزه بۆ مەبەستی جێگۆڕکێ کردنی کۆرپەلە لایەنی پێویستییە.

٣- ئاسن: لە نیوەی دووەمی سکپڕی پێویست دەبێت.

٤-فۆلیك ئەسید: بە بڕی ٠,٤ میلی گرەم لایەنی پێویستییە و لەو کەسانەدا کە پێشینەی لە دایکبوونی ساوا بە ناتەواوی زگماکی (میلۆمننگوسل) پێویستی بە ٤ میلی گرەم بڕی دەرمانی هەیە.

٥- کالسیۆمی زیادە بە تایبەت لە مانگی پێنجەم سکپڕی بە بڕی ١٠٠٠ تا ١٢٠٠ میلی گرەم ڕۆژانە پێشنیار دەکرێت.

٦- خۆراك لە ژنانی سکپڕ ئەبێت کەم قەبارە، کەمخوێ و هەمەچەشنە بێت و بە قەبارەی کەمتر لە چەند ژەمێکدا دەخورێت.

٧- سەوزەوات و میوەی تازە شوێنەواری هەمەچەشنە و موسبەتی زۆریان لە سەلامەتی دایك و کۆرپەلەدا هەیە.

٨- سود وەرگرتن لە گۆشت، هێلکە و شیر، ٣ پایەی سەرەکی خۆراکی ڕۆژانە دەبێت.

٩- لە ڕۆژەکانی کۆتایی سکپڕی، بەتایبەت ڕۆژی منداڵبوون، ڕژێمی سوپ، شیر، هەنگوین و ئاوی مریشك بەسودترە.

## نەخۆشییەکان و ڕژێمەکانی خۆراکی

١- هەندێ لە عادەتە خۆراکییەکان بە نەخۆشییەکانەوە پەیوەستن.

٢- هەندێ لە نەخۆشییەکان لە ناوچە تایبەتەکانی جوگرافیایی بڵاوبونەوەی زیاتریان هەیە.

٣- ئەو گروپانەی لە نەخۆشییەکان لە نەژاد یان هۆزە تایبەتیەکان بڵاوبونەوەی زیاتریان هەیە.

٤- تۆباکۆکان (دخانیات) یان خۆراکە سورکراوەکان یان گەرم لەگەڵ هەندێك لە نەخۆشییەکان هاوڕێی زیاتریان هەیە. وەکو (شێرپەنجەی گەروو بە خواردنە گەرمەکان).

٥- نەخۆشییەکانی جگەری، گورچیلە و دەزگای هەرس لەگەڵ هەندێ لە ڕژێمەکان توندتر دەبن.

## شێرپەنجەكان ( Tumor , Cancer )

شێرپەنجەكان یان لووەكان بە تایبەت لە هەندێ لە كۆئەندامـەكانی لـەش بـە خۆراكـەوە پەیوەندن.

١- دخانیات یان مـەوادی پێكهاتـەی تـوتن و تۆبـاكۆ بـە شـێرپەنجەی سـی و قورِگـەوە پەیوەستن.

٢- خۆراكە گەرمەكان یـان چـایی گـەرم، بـە شـێرپەنجەكانی گـەروو (بەشـێكی بـالآی كۆئەندامی هەرس) بە تایبەت لە باكوری ئێران پەیوەندی توند و جێگیربوویان هەیە.

٣- بـەكارهێنانی قارچـكەكانی دارسـتان لـەوانەیـە بـە هەنـدێ لـە پەككەوتنـەكان یـان لووەكانی جگەرەوە پەیوەندییان هەبێت.

٤- كەسانێ كە رژێمی زۆرلە گیاكان بە لایەنی مەبەست دادەنێن، بە دڵنیایی كـەمتر لـە كەسانێ كە تەنها خواردنە ئامادەكان و خواردنی خێرا (fast food) بـەكاردەهێنن، توشـی شێرپەنجەی ریخۆڵە ئەستورە (كۆلۆن) لـە كۆئەندامی هەرس دەبن (كـەمتر توشـی جۆرەكـانی شێرپەنجە دەبن).

٥- خۆراكەكانی پێكهاتەی مەوادی سلیلۆزی لــە جوملــەی ئەوانـە مـەوادی پێـستدار، دانەكانی گیایی و فاسۆلیا لە توشبوون بە شێرپەنجە بەرگری دەكەن.

٦- ماسـی گـەورەی قاورمـەكراو، گۆشـتی سـوری چـەور، خۆراكـەكانی زۆر سـوێر، شێرپەنجەكانی دەزگای هەرس، پرۆستات و ئیندۆمیتریۆس (پەردەی ناوەوەی منداڵدان) بەرەو زیاتر دەبەن.

٧- خۆراكە قەڵەوكەرەكانیش بڵاوبوونەوەی شێرپەنجەكان زیاتر دەكەن.

## نەخۆشییەكانی دڵی - دەماری و خۆراك

رژێمی زۆر لە كۆلیسترۆڵ ئەتوانێت كۆبونەوە و مژینی چەوری لە دیـواری مولولـەكانی خوێنی دڵی هان بدات و كاریگەرییەكانی جـددی دڵـی و دەمـاری لـەگـەڵ بێـت. چـەورییە ترسناكەكانی وەك كۆلیسترۆڵ و ترایگلیسراید لەگـەڵ كاریگەرییـەكانی دڵـی و دەمـاری و

مەترسی حەملەی دڵی یان جەڵتەی دڵی (myocardial infarction)ی لەگەڵ بێت و مردنی کتوپڕی لەگەڵە.

ئەو خۆراکانەی کەهۆی کەمبوونەوەی حەملەکانی دڵی یان ئازارەکانی دڵـی دەبـن، لـەم لایەنانەی خوارەوە ئەتوانین کورتیان بکەینەوە.

١- خۆراکە پڕ ڕیشاڵەکان.

٢- ماسی بە تایبەت ماسی سەلەمۆن و شاماسی.

٣- بەدەستهێنراوەکانی سویا.

٤- خۆراکەکانی دەوڵەمەند لە ئەتنی ئۆکسیدانتەکان یان زۆرێـك لـە ڤیتـامین E، A، و ڤیتامین C.

٥- خۆراکەکانی دەوڵەمەند لە فۆلەیت یان فۆلیك ئەسید، ڤیتامین B٦ و B١٢.

ئەم مەوادە خۆراکییە چەورییەکانی جۆری پارێزەر (HDL) زیاد دەکـەن، بـەلام مـەوادی پێکهاتەی کۆلیسـترۆڵ و جگەرە (LDL) یان چەورییە ترسناکەکە بەرەو سەرەوە دەبەن.

## پەستانی بەرزی خوێن و خۆراك

بە جێگیربوون گەیشتووە کە زیادبوونی خوێ لە ڕژێمەکانی خۆراکی هـۆی دروسـتبوونی پەستانی بەرزی خـوێن و کاریگەرییـەکانی دڵـی – دەمارییـە، مەترسـی جەڵتـەکانی دڵـی و مێشکی کە لەگەڵ کاریگەرییەکانی جددی و تێکچون بە هەڵقولێنی هەنوکەیی ژیان هاوڕێن، بەلام ئەتوانرێت شیاوی پێشگرتن بێـت. بـە پێـچەوانەوە ڕژێمـی زۆر لـە سـەوزی، میـوە، شـیرەمەنییە کـەم چـەورییەکان هـۆی کـۆنترۆڵکردنی پەسـتانی خـوێن و کەمبوونـەوەی کاریگەرییەکانی دەبێت. ئەبێت لە زیادکردنی خوێ بۆ خواردن هـەتا لـە منداڵیـشدا دوورە پەرێزبین.

## نەخۆشی شەکرە و ڕژێمی خۆراکی

هەرچەندە نەخۆشی شەکرە بە هۆکارەکانی جینیتیکی بۆماوەییەوە پەیوەستە، بەڵام ئەتوانی بە یەك بەرنامەی خۆراکی دەستپێکردنی دوانە نەکەوێت و کاریگەرییە سەرەکییەکانی چاوی، دڵی- دەماری، مێشکی و گورچیلەیی نەخۆشییەکە کەم دەکاتەوە. کۆنترۆڵکردنی کێش، سنووردارکردنی کالۆری وەرگیراو بەهۆی کاربۆهیدراتەکان (شەکرەکان و...) ئەتوانن هۆی کۆنترۆڵکردن و کەمبوونەوەی کاریگەرییەکانیان بن. لەبەرئەوە، سنووردارکردنی شەکر و چەوری و کەمبوونەوەی کێش لە کۆنترۆڵکردنی شەکرە ڕۆڵی کاریگەرییان هەیە.

## خۆراکەکانی دژی شێرپەنجە

شێرپەنجەکان یان کانسەرەکان (cancer) ئەو نەخۆشییانەن کە لە کۆئەندامە جیاوازەکانی لەشدا دروست دەبن و جۆرە جیاوازەکانیان هەیە. لووەکان، ئەو تێکچونانەن کە لە بەشە جیاوازەکانی لەش سەرچاوە دەگرن و ئەتوانن باش یان پیس بن. بۆ نمونە لووی ئێسك ئەتوانێت باش و بێ مەترسی بێت و یان مەترسی گیانی هەبێت و زیاد لە ڕادە بە ئەهمییەت بێت.

زۆرێك لە شێرپەنجەکان لە گەشەی خێرای خانە پێنەگەیشتوەکان لە بەشە جیاوازەکان، وەك دەزگای هەرس (گەروو، گەدە، ڕیخۆڵە ئەستورە) سەرچاوەی گرتووە و کێشەکان زۆر بەجدی بۆ نەخۆش دروست دەکەن، هەرچەندە زۆرێك لە لووە پیسەکان سەرچاوەی جینیتیکن و یان زەمینەی خێزانی تیایاندا ڕۆڵی هەیە، بەڵام گروپێکی زۆر لە ئەوانە پەیوەستن بە هۆکارەکانی موحیتی و مەوادی خۆراکییەوە.

مەوادی مەوجود لە گۆشتی سۆسیج، کالباس، مەوادی پارێزەر و ڕەنگی و ڕادیکاڵە (توند) ئازادەکان هۆی گۆڕانەکانە لە ئاستی خانەییە و لە ئەنجامدا، هۆی دەرکەوتنی خانە ناهاوکارەکان و گەشەی نەشیاو و کۆنترۆڵکردن و زۆربوونی دەرەکی لە بەرنامەی خانە و گەردیلە دەبن و لە کۆتاییدا شێرپەنجە دەردەکەوێت.

ڤیتامینەکانی C وA و E و فلاونۆیدەکان و پۆلیفینیلەکان کە لە مادە خۆراکییەکانی خوارەوەدا دیاریدەکرێن. سیفەتی ئەنتی ئۆکسیدانت (دژی ئۆکساندن) یان هەیە.

## مــەوادی خــۆراکی ئــەنتی ئۆکــسیدانت پێکهاتــەی ڤیتامینەکانی C وA و E ین.

ڤیتامینەکانی C:

گەڵای کەلەرمی، کەلەرمی برۆکلی، بیبەری سەوز، شلیك (تووە فەرهەنگی)، پرتـەقاڵ لیمۆی هیندی، سپێناخ، بیبەری سوری شیرین.

ڤیتـامین E: گیـای چـرۆی گـەنم، مێـشکی میوەکـان، غلاتـی مقـوی سـازکراو، ڕۆنـە ڕووەکییەکان.

ڤیتامینA : ڤیتامینA لە میوەکان و سەوزییە ڕەنگ زەردەکان یـان سـەوزی تـۆخ و یـان سور بوونی هەیە.

گێزەر، کولەکەی زستانی، سپێناخ، کەلەرمی برۆکلـی، بیبـەر، کاڵـەك، انبـە، قەیـسی، شوتی. پەتاتە، ئاوی تەماتە.

## گورچیلە

خۆراك و بەردی گورچیلە

بەردەکانی گورچیلە یان میزەڕۆ یان میزەڵدان پەیوەست بە هۆکارە زۆرەکـانی خـۆراکین، هەرچەندە هەندێ لە کەسەکان زەمینەکانی جینیتیکی توشبوون بە بەردی گورچیلەیان هەیە یان توشبوون بە نەخۆشییە تایبەتییەکانیان هەیـە کـە ئـەم کاریگەرییـە بڵاوبونـەوەی زیـاتری لەوانە دەبێت.

**یەکەم:** لەو کەسانەی شـلەمەنییەکان بەکـەمی بەکارئـەهێنن، توشـبوونیان بـە نەخۆشـی بەردی گورچیلە زیاترە و هەروەها کەسانێك کە عادەت بە خۆراکە کەمئاوەکان یان عادەت بە تینوێتی و ئیشە قورسەکانیان لـە بیابان و صەحرا هەیـە. لەگـەڵ کێـشەکانی گورچـیلەیی زیاتر ڕووبەڕوو دەبنەوە.

**دووەم:** بەردەکان جۆرە جیاوازەکانیان هـەن، لـە جوملـەی ئەوانـە بـەردی کالـسیۆمی، ئۆگزالات، بەردەکانی ترشی یوریکی، بەردی ئیـسترِاوڤیتی، بـەردی سیـستینی، (بـەردەکانی کالسیۆمی ٧٠ تا ٨٠ لە صەدی بەردەکانی دروست دەکەن).

**سێیەم:** رژێمە خۆراکییەکانی پێکهاتەی ڤیتامین D زیاد (لەبەرئەوە زیاد بەکارهێنانی بێ سەرچاوەی ڤیتامین D یان گۆشتی سور) لە دروستبوونی بەردی گورچیلە بەشداری دەکەن.

**چوارەم:** بەردەکانی کالسیۆمی لەگەڵ خۆراکەکانی خوارەوە پەیوەستن:

دەرمانەکانی پێکهاتەی هۆرمۆنی پاراپایرۆید، شێرپەنجە تایبەتەکان (مەلتیپل مایلۆما و لووی سی)، کێشەکانی گورچیلەیی، شیرەمەنی زۆر، بەکارهێنانی زیاد لە رادەی کالسیۆم.

**پێنجەم:** بەردەکانی ترشی یوریکی لەو کەسانەی زیادبوونی ترشی یوریکیان لەگەڵە میزی ترش و بەکارهێنانی گۆشتی سوری زۆر پەیوەندە. پێشنیار بە بەکارهێنانی شلەمەنییە زۆرەکان، دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی زیاد لە رادەی تەواوکەرە خۆراکییەکانی وەك ڤیتامین D یان کالسیۆم ئەتوانی لە کەناری هاندانی گونجاو، پێش بە پەرەسەندنی بەردەکانی میزەڕۆ بگریت.

## پەككەوتنی جگەر و گورچیلە و خواردن

لە دروسبوونی پەککەوتنی گورچیلە جگەر، هۆکارێکی بێ شومار رۆڵیان هەیە

١- هەوکردنە موزمینەکان و ماوەدرێژبوەکان لە هۆکارەکانی سەرەکی پەککەوتنی گورچیلە و جگەرن.

٢- پەستانی خوێن، شەکرە، بەردی گورچیلە و ژەهراویبوونەکان هۆی زیانگەیاندنە بە گورچیلەکان، و چالاکییەکانیان کەم دەکەنەوە.

٣- رژێمە زۆرەکان لە خوێ ئەتوانن هۆی توندبوونی پەککەوتنی گورچیلە بن و یان ئەوەی کە هۆی کۆبونەوەی ئاو خوێ لە لەشدا بووە و لەگەڵ ئاوسانی گشتی لەش (ئۆدیما) هاورێ بێت. رشژێمە تێرەکان لە پۆتاسیۆم و فۆسفۆر لە پەککەوتنی گورچیلە قەدەغەیە. لەم نەخۆشینە رژێمەکانی خۆراکی تایبەتی شیلوی گرنگییە و نیازی بە تێڕوانینی پزیشکی چارەسەر و راوێژکردنی خۆراکپێدان هەیە.

## خۆراك لە شیردەریدا

١- پێویستە دایك لە شەو و ڕۆژدا کەمێك پرۆتینی زیاتر بەکاربهێنێت. (٢٠ تا ٣٠ گرەم زیاتر لە ئاسایی).

٢- کالۆری: ٥٠٠ کالۆری زیاد بەرامبەر نیازی ئاسایی پێویستە.

٣- شیر = بە هۆی بوونیکالسیۆم لە شیردا، پێویستە دایك ڕۆژانە یەك لیتر شیر یان بەرهەمە شیرەمەنییەکان وەك ماست، پەنیر، دۆ بەکاربهێنێت.

٤- مەودای خۆراکی وەك شیر و پرۆتینەکان، پاش لە کاریگەری هاندەری مژینی مەمکی دایك لە لایەن کۆرپەلەوە، ڕۆڵی سەرەکی لە دروستبوونی شیردا جێ بەجێدەکات.

٥- سود وەرگرتن لە کونجی، بادام، فستەق، سوپ، سەوزی، ئاشی گۆشت، ئاشی جۆ، هێلکە، ترێ، ڕەیحان، ئاوی گێزەر و کاڵەك لە مەوادی کاریگەری زیادکردنی شیرن.

٦- ئەڵبەتە شیاوی باسە تەندروستی خۆراکی و وەرزشی ڕێك و پێك لە کەناری مەوادی خۆراکی پێویستی شوێنەواری موسبەتیان لە شیردەردا هەیە.

## خۆراکی منداڵ

١- منداڵ بەهۆی گەشەی خێرا بەتایبەت لە ٢ ساڵی یەکەمی ژیانی ٥ تا ١١ ساڵی و دەوروبەری دەورەی باڵغبوون بە مەوادی خۆراکی نیازی زیاتری هەیە.

٢- گونجاوترین خۆراك بۆ منداڵ لە ٦ تا ١٢ مانگی یەکەم شیری دایکە، هەرچەندە شیری وشك یان شیری مانگا یان بزن لە ئەولەوییاتەکانی دوای ئەون، ئەگەر بەهەر هۆیەك دایك نەیتوانی شیر بدات.

٣- شیری دایك لە دەورانی منداڵی جێگرەوەی نییە و هەم بۆ دایك و هەم بۆ کۆرپەلە، شوێنەواری فیسۆلۆجیکی موسبەتی هەیە.

٤- شیری دایك خاوەنی جۆرەها مەوادی پارێزەرە و زیادکەری بەرگری ساوایە و کە شمولی: ئەنتی بۆدییەکان، ئیمینوگلۆبیولینەکان و....ە. لەماوەی ئەوەی کە شوێنەواری دەرونی ئیعجاز ئامێزی بۆ ساوا هەیە.

٥- پاش لــە مــانگی شەشــەم، مــەوادی خــۆراکی یارمەتیــدەر، وەك پورەکــان، هێلکــە، حەریرەی بادام، ناردی بــرنج (فرنــی)، ئــاومیوە و... بــۆ گەشــەی هــەموو لایــەکانی منــداڵ بەسودن.

٦- کێشکردنی منداڵ یەکێك لە دیاردە بنەڕەتیەکانی منداڵــە لــە مەســیری ســەلامەتیدا. نمونەدارەکانی (ڕێڕەوی سەلامەتی) کە بۆ منداڵان لە ڕێگەی ناوەندە تەندروستیەکان کێشانە دەکرێت و گەشەی لە دایکبوونی منداڵ لەگەڵ گەشەی کرداری گونجاو لەگەڵ تەمەنەکــەی لە ڕێڕەوی سەلامەتی لایــەنی خــوارەوە دانــراوە و لەلایــەنی هەڵــسەنگاندن و فراوانبینــی و چاکسازی دادەنرێت. هەر جۆرە (کەمیەکی کێش) یەکێك لە نیشانەی نەخۆشیە، بە تایبەت لە کۆئەندامی هەرس یان بەدخۆراکیدا، کــە چارەســەر دەکرێــت و دەبێــت توێژینــەوەی بــۆ بکرێت.

## بەشەکانی مەوادی خۆراکی

١- شەکرەکان (هایدرۆکاربۆنەکان).

٢- پرۆتین و ئەمینۆ ئەسیدەکان.

٣- چەوری (لیپیدەکان).

٤- ڤیتامینەکان.

٥- مەوادی کانزایی.

٦- ئاو.

شەکرەکان (هایدرۆکاربۆنەکان):

١-بە سەرچاوەی سەرەکی وزە لە لەشدا دێنە ئەژمار.

٢- بە سەرەکیترین سەرچــاوەی ســوتەمەنی بــۆ خانــەکانی لــەش، بــە تایبــەت مێــشك و ماسولکە دێتە ئەژمار.

٣- بەشێوەی نیشاستە (شەکری ئاڵۆز) یان مــەوادی شــەکری گلوکــۆز و فرکتــۆز کــە شەکرە سادەکانیان پێ دەوترێت.

٤- سەرچاوەی سەرەکی شەکرە ئاڵۆزەکان (ئاڵۆز یان قورس) پێکهاتەی نیشاستە: نان، برنج، ڕشتە (ماکارونی)، غلات، میوە و سەوزی دەبێت.

٥- شەکرە سادەکان لە میوەکان، شەکراو، قەند و شەکر.

٦- سەرچاوەی ٥٥ تا ٦٠ ٪ وزە (کالۆری) لایەنی پێویستی لەش لەڕێگەی کاربۆهایدرەیتەکانەوە دابین دەبێت.

٧- شەکری قامیش یان چەوەندەر (سوکەرۆز)، شەکری شەربەتی گەنمەشامی (فرکتۆز) لە بەشێك لە وڵاتەکان سەرچاوەی سەرەکی مەوادی شەکرین.

٨- هەر گرامێك کاربۆهیدرات، ٤ کیلۆ کالۆری وزە لە لەشدا دروست دەکات.

## چەورییەکان (لیپیدەکان، کۆلیسترۆڵ و ترایگلیسراید دەگرێتەوە):

١- ئەم مەوادانە هەم لە بەرهەمە حەیوانییەکان و هەم لە دانەکانی ڕۆنی گیایی بەدەست دەکەوێت.

٢- چەورییەکان بە دوو شێوەی شل و نیمچە ڕەق لەبەردەستدا هەن. چەوریيە ڕەقەکان بۆ گشتی، بەتایبەت بۆ بەساڵاچووان ئەتوانێت ترسناك بێت.

٣- چەوری بە گەورەترین سەرچاوەی وزە لەلەشدا و زیندەچالاکی (میتابۆلیزم) ئەژمار دەکرێت. هەرچەندە کۆبونەوەیان هۆی زیانە جددییەکان دەبێت.

٤- بە گروپێك لەو چەورییە پێویستانەی کە لەش توانای بۆ دروستکردن و بە دەستهێنیان نییە، دەوترێت ترشی چەوری، کە دەبێت لە دەرەوەی لەش دابین بکرێت.

٥- چەوری تێر ئاساییانە لە پلەی گەرمی ژوور، سپی یان مۆمی شێوەیە و ئەگەری بەسەرچوونی کەمە. سەرچاوەی سەرەکیان لە کەرە، پەنیر، شیری پڕ چەوری، خامە، چکلێت، ڕۆنی گوێزی هندی، ڕۆنی خورما، پیوی بەراز، گۆشتی سوری مانگا و بەرخ بووە و لە پێستی مریشکیش دەست دەکەوێت.

٦- چەوری ناتێر، ڕۆنەکانی کە لە پلەی گەرمی ژووردا شلەن، وەك ڕۆنی گڵۆبەڕۆژە، گەنمەشامی، سویا، دانەی لۆکە و...

٧- چەوری ترانس یان ڕۆنی هایدرۆجینی، کە لەگەڵ زۆربوونی هایدرۆجین بە ڕۆنی ڕووەکی بەرهەم دێت. ئەم ڕۆنە لەو چەوریە بەکارهێنراوانەیە لە کاڵای بازرگانی، شیرینییەکان و تەناقولات دەبینرێت.

٨- نەخۆشییەکانی دڵی لەکاتی بەکارهێنانی زۆری چەوری باسی لێوە کراوە.

٩- هەر کاتێك ڕۆنەکان (چی ڕەق و چی شل) گەرم بکەین و پلەی گەرمی زیاد لە ڕادە خراپە، مادەی ژەهری بەناوی نەکرۆلێن دروست دەکات کە زیاد لە ڕادە بۆ سەلامەتی ترسناکە. لەبەرئەوەی، پلەی گەرمی بەرز و بەکارهێنانی بەردەوام لە یەك ڕۆن بۆ چەند لایەنێك، بۆ سەلامەتی مرۆڤ زیانبەخشە.

١٠- ڕۆنی ماسی پڕ لە ٢ جۆری ترشی چەوریە. ئۆمیگا ٣، یەك ترشە چەوریەکی پێویست و سودمەندە کە هۆی بەرگری لە ڕەقبوونی دەمارەکان، بەتایبەت دەمارەکانی دڵی دەبێت (کە بە نەخۆشی ڕەقبوونی خوێنبەربوونەکان یان ئارترۆسیکلێرۆسس ناسراوە).

١١- لە کۆمەڵەی ترشە چەوریە بنەڕەتیەکانی لەشی مرۆڤ: ترشی لینۆلیك، ترشی لینۆلینیك و ترشی ئەراچیدونیکە.

١٢- کۆلیسترۆڵی خوێن بە جۆرێکی چەوری خوێن ئەژمار دەکرێت کە دوو گروپ دەگرێتەوە: HDL یان چەوری (باش) و پارێزەری لەش و LDL کە چەوری (خراپە) یان زیانبەخش و ترسناك ناودەبرێت. لەبەرئەوە LDL هۆی مژینی لە دیوارەکانی دەمارەکانی دڵی و مێشکی دەبێت و هۆی خراپی جدی بۆ سەلامەتی مرۆڤ دەبێت. ڕۆنی زەیتون و کانولا پێویستە لە بەرنامەی خۆراکی جێگەی تایبەتی هەبێت و بەپێچەوانەوە چەوریەکان زیانبەخش و تێرن، وەك گۆشتی سوری پڕچەوری و شیرەمەنیە پڕ چەوریەکان پێویستە لە ئەولەویەتەکانی لانی کەمی بەرنامەی خۆراکی دادەنرێت.

## پرۆتین:

١- لەشی مرۆڤ بۆ دروستکردنی ئەندامەکان، ماسولکەکان و ئەندامەکان بە پرۆتین نیازی جددیان هەیە. بەشە بچوکەکانی پرۆتینەکان ئەمینۆئەسیدەکانن.

٢- سەرچاوەی سەرەکی پرۆتین لە ڕژێمی گیایی: سەوزی و دانەکانی دانەوێڵەکان، غلات و مێشکی میوەکان و دەنکەکان سەرچاوەی سەرەکین.

٣- گۆشــتەکان بــە تایبــەت گۆشــتی مانگــا، گوێرەکــە، مریــشك، ماســی، بەرهەمــە شیرەمەنییەکان و دەرياييەكانيش لە سەرچاوەی گرنگی حەیوانی ئەژمار دەکرێن.

٤- گروپە گرنگەکانی پرۆتین:

گروپی یەکەم: شیر، ماست و کەشك پرپرۆتینی زۆر باشن. لە شـیری تـازە ⅔ ٪ پـرۆتین بوونی هەیە.

گروپی دووەم: گۆشتەکان و هێلکەی مریشك، ئاساییانە ١٥ تا ١٨ ٪ ئەوانەن کە پرۆتین پێکدەهێنن.

گروپـی سـێیەم: غـلات و دانەوێڵـەکان، هەرچـەندە پرۆتینـەکانیان زۆرە. بـەڵام بـەهای خۆراکیان کەمە، ئەڵبەتە بە تێکەڵکردنی غلات و دانەوێڵەکان ئەم کێشەیە کـەمتر دەبێـت. پرۆتینەکانیان نێوان ٨ تا ١٣٪ دەبێت.

گروپی چوارەم: فستەق، گوێز، فندق، بادامی زەمینی، کونجی، بـڕی پرۆتینـی ئەوانـە زۆر زیاتر لە (٢٠ - ٣٠ ٪)یە و هەمەچەشنەی و هەمەجۆرییان داواکراوە.

٥- ئەو کەسانەی کە ڕژێمی خۆراکی (لاوازی)یان هەیـە، نابێـت بـەکارهێنانی پرۆتینـی کەسەکە خۆی سنوردار بکەن.

٦- کەسانی لـەشـساز (وەرزشەکانی لەشجوانی) ڕۆژانە بە ١٤٠ تا ٧٠ گرەم پێویـستییان هەیە.

٧- بەکارهێنانی زیادی پرۆتین بۆ زیادکردنی قەبارەی ماسولکە بـۆ گورچیلـەکان زیـانی جدی هەیە. لەبەرئەوە، بەکارهێنانی بێ سـەرچـاوە و نـا مـەنتقی پـرۆتین و زیـادەڕەوی لـە بەکارهێنانی پرۆتین یان یارمەتیدەرە خۆراکییەکان یان پاودەرەکـانی مقـوی ئـەتوانن زیـاد لـە ڕادە ترسناك بن.

٨- کەمبوونی پرۆتین هۆی تێکچون دەبێت لە چالاکی ئەنزیمەکانی لەشدا، کەمبوونەوەی زیندە چالاکی، کەمبوونی وزە و زوو هیلاکبون دەبێت.

٩- لە حاڵەتی برسێتی و بـەڕۆژووبوونی ماوەدرێـژ، پـاش لـەوەی کـە کاربۆهیـدرات و چەوری بەکارهێناوە، لەش لە پرۆتینە خـەزنکراوەکان سـود وەردەگرێـت کـە وزەی لـەش دابین دەکات و ئەمەش بە زیانی ئەو کەسەیە.

١٠- پرۆتینەکان لە ئەمینۆ ئەسیدە پێویستەکان و ناپێویستەکان پێك دێت کە هەرچی بڕی جۆری پێویستی زیاتر بێت، خۆراکەکە مەرغوبترە.

١١- هەرگرامێك چەوری ٩ کیلۆکالۆری وزە دروست دەکات، بەڵام ئەم بڕە لە پرۆتیندا ٤ کیلۆکالۆری دەبێت.

١٢- خشتەی بەهای خۆراکی بە لەبەرچاوگرتنی پلەی ١٠٠ یان بەرز بۆ هێلکە و پێوانەکردنیان لەگەڵ هێلکەدا.

١٣- وەرزشکاران سەرنج بدەن:

أ- پێش لە تەمرینی قورس، خۆراکی پڕ پرۆتین بەکارنەهێنن.

ب- قەبارەی زیادی پرۆتین ئەگەری دەرکەوتنی ئازارەکانی سکی و کێشەکانی هەرسی زیاد دەکات.

ج- بە دڵنیاییەوە پاش لە وەرزشە توندە فیزیاییەکان، پرۆتین بەکاربهێنن.

د- پرۆتینی زیاد قەبارەی میز زیاد دەکات و ئاوی لەش زیاتر لە دەست دەچێت.

| جۆری مادەی خۆراکی | بەهای خۆراکی |
|---|---|
| هێلکە | ١٠٠ |
| شیر | ٩٣ |
| برنج | ٨٦ |
| ماسی، گۆشتی گوێرەکە | ٧٥ |
| زەرات | ٧٢ |
| ئاردی دانەی لۆکە | ٦٠ |
| گەنم | ٤٢ |

هـ- ڕێژەی لە صەدی پرۆتینی حەیوانی خۆراك نابێت زیاد لە ٤٥٪ بەرکەوتی پرۆتین بێت.

١٤- مەوادی خۆراکی پڕ پرۆتین بۆ وەرزشکاران پێشنیار دەکرێت، ئەڵبەتە بە نیشانەی گرنکی ڕێکخستنی زیاترین: بادام، فستەق، بوندوق، مێشکی ناوکە کولەکەی حەڵوایی، کونجی، گوێز، گۆشتی گوێرەکە، گۆشتی ماسی ئازاد، زمانی پاك، جگەری مەڕ، جگەری گوێرەکە و مانگا، دڵی مریشك و کەڵەشێر، پاقلە، فاسۆلیا، نیسکی خاو، چەکەرە، پۆڵکەی خاو، ڕۆبیانی تازە، پەنیر، کەشك، هێلکە، گۆشتی مەڕ و ماسی سپی.

١٥- پرۆتین بە کاریگەری برژاندن خراپ نابێت و لە نێو ناچێت، بەڵکو هەرسکردنی ئاسانتر دەبێت.

١٦- کواشیۆرکۆر (Kwashiorkor) نەخۆشی بەهۆی کەمبوونی پرۆتین و کە بەزۆری لە منداڵان بەهۆی بەدخۆراکی یان هەتا زوو لە شیر گرتنەوەی منداڵیش و پێدانی ئاردی برنج یان غلات بە دەست دێت.

ئەم منداڵە مقاوەمەیەکی کەمی لە بەرامبەر هەوکردنە میکرۆبییەکاندا هەیە. بە ئاشکرا ئەم منداڵانە، گۆڕانی ڕەنگی مووەکان، سك گەورەیی و ئاوسان و کێشەکانی کێشی دیار و ئاشکرا دەبێت. ئەم منداڵانە کە بەزۆری لە بەدخۆراکی ژیان بەسەر دەبەن، توشی کێشەکانی هۆشی و ڕەفتاری دەبن. لە ئەفریقا ئەم نەخۆشییە باوە.

## فایبەرەکان (ریشاڵ):

بەشێك لە مەوادی خۆراکین کە سەرچاوەی گیایان هەیە.

١- ئەم مادانە لە لەشدا نامژرێن.

٢- ریشاڵەکان بۆ دوو جۆری گیراوە و نەگیراوە دابەش دەبن.

٣- ریشاڵەکانی گیراوە لە تووە فەرهەنگی (شلیك)، سێو، دانەوێڵەکان، پاودەری جەوی دووسەر، سوس، و جۆری نەگیراوە لە سوسی گەنم و نانی تەواو، ریشاڵی ماکارۆنی و غلات و ئاردی سپی دەبینرێن.

٤- ریشاڵی گیراوە هۆی کەمبوونەوەی شەکری خوێن و کۆلیسترۆڵ دەبێت.

٥-خۆراکە ئامادەکان و دروستکراوەکان کەمتر ریشاڵیان هەیە، بە هەمان هۆکار مەترسیشیان هەیە.

٦- ریشاڵی نەگیراوە بە مژینی ئاو قەبارەی پیسایی زیاد دەکات و قەتعەن لە بەرگری کردن لە شێرپەنجەی ریخۆڵە ئەستورە کاریگەر دەبن.

٧- هەر کەسێك رۆژانە بە ٢٥ تا ٣٠ گرەم ریشاڵ پێویستی هەیە.

## ناساندنی ڤیتامینە پێویستەکان

### ڤیتامینەکان:

ڤیتامینەکان ئەو مەوادانەن کە بۆ لەش پێویستن و لە ڕێگەی لەشەوە دروست ناکرێن. ڤیتامینەکان وزە دروست ناکەن و وەکو چەوری و کاربۆهیدراتەکان بە سەرچاوەی وزە ئەژمار ناکرێن. ١٤ ڤیتامینی پێویست بوونیان هەیە کە ژمارەیەك لەوان لە چەوری دا دەتوێنەوە و گرووپی تر لە ئاودا ودەبنە گیراوە.

ئەم خاڵانەی خوارەوە لە بواری ڤیتامینەکاندا شایەنی گرنگی پێدانن.

١- ڕۆڵی سەرەکی ڤیتامینەکان لە پرۆسەی میتابۆلیزمی (زیندەچالاکی) خانەکاندایە. دروستبوونی گەردیلەی خانەکان، لە لەبەرگرتنەوەی جینیتیکی (بۆهێڵی) و کۆنترۆلکردنی ئیشی میتابۆلیزمی خانەکان بەرپرسیارن.

٢- هەرچەندە ژمارەیەکی زۆری پەیوەست بە ماوە و بێ ماوە هەڕەمەکییانە بە بەکارهێنانی کەپسولەکانی ڤیتامین دڵخۆشیان هەیە، بەڵام نەبێت بزانن کە بەکارهێنانی کەپسولەکانی ڤیتامین زیاد لە ڕادەی پێویست، وەکو ژەهرێك کار دەکەن. لەبەرئەوە، زیاد بەکارهێنانی ئەو دەرمانانەی ڤیتامینی تێدایە، جگە لە زیان و زەرەر بەرهەمێکی تری نییە.

٣- بەکارهێنانی زیاد لە ڕادەی ڤیتامین C، هۆی زیادبوونی میز و ڕوشانی ڕیخۆڵە دەبێت.

٤- بەکارهێنانی زیادی ڤیتامین B٦ هۆی نەخۆشییەکانی جگەری دەبێت.

٥- سود وەرگرتنی زیاد لە ڕادەی پانتوتینیك ئەسید هۆی کەمبوونی مژینی ترشە چەورییە پێویستەکان دەبێت لە لەشدا.

٦- ڤیتامینەکانی A، PP، B٦، پانتوتینیك ئەسید، فۆلیك ئەسید، ڤیتامین C لە گەشەی ماسولکەکان و ئێسکەکان ڕۆڵێکی سەرەکیان هەیە.

٧- ڤیتامین B٦، C ، B١٢ و فۆلیك ئەسید و لە دروستکردن و زیادبوونی خڕۆکە سورەکانی خوێن (RBC) ڕۆڵێکی کاریگەریان هەیە.

٨- ڤیتامینەکانی B١ و پانتوتینیك ئەسید و بیوتین لە هیلاکی و بێهێزی و ئازاری گشتی ماسولکەکان بەرگری دەکەن.

٩- کەسانێ کە تەنها بە گیاخۆری ژیان بەسەر دەبەن، توشی کەمبوونی ڤیتامینەکانی B١٢، ڤیتامین D و B٢ دەبن، ئەڵبەتە شیر بەتەواوکەری خۆراکی زۆر باشی مەبەستی دابینکردنی ڤیتامین B١٢ ئەژمار دەکرێت.

١٠- ئەو کەسانەی کاریگەرییەکانی بێ ئیشتیهایی دەماریان هەیە توشی کەمبوونی ڤیتامینەکان و مەوادی کانزای دەبن کە ئەبێت لە ڕێگەی پزیشکی چارەسەرەوە چارەسەری بۆ بکرێت.

١١- ئافرەتان بەتایبەت لە تەمەنی بێ نوێژی (١٤ تا ٤٥ ساڵ) پێویستە لە ڤیتامین C و ئاسن و فۆلیك ئەسید و کالسیۆم زیاتر سود وەربگرن، لەبەرئەوە، شیر، ئاوی تەماتە، کەلەرمی پیچ و بیبەری سور و ئاویتەکان زیاتر سودمەند دەبن.

١٢- دەرمانی کۆلیسترامین کە لە چارەسەری کۆلیسترۆڵ (چەوری) زیادی خوێندا بەکاردەهێنرێت، مژینی ڤیتامینەکانی K و E و D و A دوادەخات.

١٣- ئەگەر ڤیتامین E و A زیاد بەکاربهێنن، هۆی تێکچون دەبن لە مژینی ڤیتامین K دا.

١٤- کەسانێ کە دەرمانی سەلفاسالازین بۆ نەخۆشی کۆلۆن (ئەلسرەیتیف کولایتس) یان کرۆن یان ڕۆماتیزمی جومگەیی بەکارئەهێنن، ئەبێت مەوادی پێکهاتەی فۆلیك ئەسید بەشێوەی تەواوکەر بەکاربهێنن.

١٥- لەکاتی بەکارهێنانی ئەنتی بایۆتیك (دژە زیندەگی) بە تایبەت لە جۆری هەرەمەکییانە کە ئەو کەسانە هەر لە سەرمابوون تا سکچون بە بەکارهێنانی ئەنتی بایۆتیك بەبێ مۆڵەتی پزیشك ڕووی لێ دەکەن، توشی کەمبوونی ڤیتامین K و B دەبن.

١٦- دەرمانی دژی تەشەنوج فینیتۆین لەکاتی بەکارهێنانی ماوەدرێژ دەبێتەهۆی کەمبوونی ڤیتامین K و D و فۆلیك ئەسید.

١٧- لەکاتی پێویستی بۆ بەکارهێنانی ڤیتامین ئەبێت لەگەڵ خواردندا بەکاربێت، لەبەرئەوە، ئەوانە بەزۆری لە چەوریدا گیراوەن و هاوڕێ لەگەڵ چەوری خۆراك باشتر دەمژرێن.

١٨- خۆراکەکە لەگەڵ بڕێکی کەم ئاو بکوڵێنرێت تا ئاوەکەی بە تەدریجی هەڵم دەکات.

١٩- بە مەبەستی پاراستنی ڤیتامینی سەوزەواتەکان بە ئاوی گەرم بکوڵێنرێت.

٢٠- ڤیتامینەکانی K و E و D و A لە چەوریدا گیراوەن و بە چالاکی گورچیلە و کیسەی زراو پەیوەستن و ڤیتامینی B و C لە ئاودا تواوەن.

## ڤیتامینە دەرمانی یەکان

**ڤیتامین A: VITAMIN – A**

ناوی بازرگانی: (Aquasol A)، (Sol A)، (Vi-A)، (Vitan A)، (Acon)، (Afaxin)، (Agiolan)

شێوەی دەرمان: حەب و کەپسول ٢٥٠٠٠ و ٥٠٠٠٠ یەکەیی و دەرزی ٢٥٠٠٠. ٥٠٠٠٠ یەکە، مەلهەم، قەترەی ٥٠٠٠ یەکەیی.

بەکارهێنان: قەرەبوکەرەوەی کەمی ڤیتامین A. لەکاتی کەمبونی ئەم ڤیتامینە کە دەبێتەهوی وشکی پێست و وشکی چاو شەوکوێری و تەنانەت کوێریش.

بەکارنەهێنان: بەکارنایەت لەکاتی زۆربوونی ڤیتامینەکە، حەساسیەت بەم ڤیتامینە.

ژنی سکپڕی: گروپینابێت ڤیتامین A زۆر بەکاربهێنرێت چونکە دەبێتەهۆی کەمبوونی هۆرمۆنی سکپڕی.

مندالّی شیرە خۆرە: نابێت بڕێکی زۆر وەربگیرێت چونکە مەترسیدارە بۆشیرەخۆر.

کاریگەری لاوەکی: سەرگێژبوون، سەرئێشە، زۆربوونی مادەی نوخامی هێلّنجدان، ڕشانەوە و ڕەنگپەڕین.

بڕی دەرمان: گەورەکان خۆراکی ١٠٠٠٠ تا ٢٥٠٠٠ یەکە لەڕۆژێکدا بۆ ماوەی ١ تا ٢ هەفتە منالاّن بەئەندازەی ٥٠٠٠ یەکە بۆهەر کیلۆگرامێك لەکێشی لەش لەڕۆژێکدا بەشێوەی خۆراکی. مەلّهەمەکەی ڕۆژی ٢ جار لەچاوی بمالّن.

**ڤیتامین B1 (پیامین): (THIAMINE) VITAMIN B1**

ناوی بازرگانی: (Thiamine)، (Pabrinex)

شێوەی دەرمان: حەبی ١٠٠ و ٣٠٠ میلی گرامی و دەرزی ١٠٠میلی گرامی.

گروپی دەرمان: VITAMINE

بەکارهێنان: بەکاردەهێنرێت بۆ کەمی ڤیتامین B١، کەمبوونی ئەم ڤیتامینە دەبێتەهۆی نەخۆشی بەربەری (نەخۆشییەکە بەهۆی کەمبونی ڤیتامینB١ وە دروست دەبێت کە دەبێتەهۆی ئارەزوونەکردنی خۆراك، سکچون، لاوازی، دابەزینی پلەی گەرمی لەش، ناتەواوی دڵ خەمۆکی، تورەی).

بەکارنەهێنان: بەکارناهێنرێت بۆ کەسێك کە حەساسیەتی بەم ڤیتامینە هەبێت.

منداڵی شیرە خۆرە: زۆربوونی ئەم ڤیتامینە دەبێتەهۆی ژەهراویبونی شیرەخۆر بە مەپیل گلایۆکساڵ کە دەچێتە ناوشیر.

کاریگەری لاوەکی: خوران، هێڵنجدان، سکچون، هەناسەتەنگی.

بری دەرمان: لەسەرەتادا بۆ ماوەی ٢ هەفتە ١٠ تا ٥٠٠ میلی گرام رۆژانە ٣ جار و پاشان رۆژانە ٥ تا ١٠ میلی گرام بۆ ماوەی ١ مانگ وەردەگیرێت.

## ڤیتامین بی ٢ :VITAMINE B٢ (RIBOFLAVIN)

شێوەی دەرمان: دەرزی ٥ میلی گرام/٢ میلی لیتر.

گروپی دەرمان: VITAMINE

بەکارهێنان: بۆ چارەسەری کەمبونی ئەم ڤیتامینە بەکاردێت. کەمبوونی ئەم ڤیتامینە دەبێتە هۆی قلێشان لەلێوەکاندا و دەبێتەهۆی زۆربوونی دەمارەباریکەکان لەناو چاودا وە زیاتر چالاککردنی گورچیلەکان و زەردبوونی میز کە هیچ مەترسیەکی نیە.

بەکارنەهێنان: کاتێك حەساسیەت بەم دەرمانە هەبێت و لەکاتی ئاوی مرواری چاو (ئاوی سپی).

ژنی سکپڕی: گروپینابێت وەری بگرێت لەماوەی سکپڕیدا.

منداڵی شیرە خۆرە: دەبێتەهۆی حەساسیەت و نەخۆش کەوتنی.

کاریگەری لاوەکی: زەردبونی ڕەنگی میز بەرەنگێکی تێر.

بری دەرمان: گەورەکان و منداڵانی زیاتر لە ١٢ساڵ ٥ تا ١٠ میلی گرام ماسولکەیی IM، رۆژانە ١ تا ٢ جار وەردەگیرێت. منداڵانی کەمتر لە ١٢ ساڵ ٢,٥ تا ٥ میلی گرام IM، رۆژانە ١ تا ٢ جار.

## ڤیتامین B٣ (نیکوتینك اسید):VITAMINE B٣ (Nicotinic Acid)

نــاوی بازرگــانی: (Nicotinex); (Nicolar);(Nicobid); (Niaspan); (Slo)، (Niacin)

شێوەی دەرمان: کەپسولی (٥٠٠،٤٠٠،٣٠٠،٢٥٠،١٢٥) میلـی گـرام و ئیلیکزیـری ٥٠ میلی گرامی /٥ میلی لیتر و (٤٧٣،٤٠٠٠) میلی لیتر و دەرزی ١٠٠ میلـی گـرام/ میلی لیتر (٣٠ میلی لیتر) وحەبی (٢٥٠،١٠٠،٥٠،٢٥، ٥٠٠) میلی گرام.

گرووپی دەرمان: VITAMINE

بەکارهێنان: دابەزینەری چەوری خوێن، بۆ چارەسەری ئیلتیهابکردنی پێست، کـەمبوونی ئەم ڤیتامینە لەلەشدا دەبێتەهۆی سکچون، بورانەوە، خەمۆکی، بێخەوی، ناتەواوی پێـست و ئەعصاب.

بەکارنــەهێنان: بــەکارناهێنرێت بـۆ کەسـێك کـە حەساسـیەتی بـەم ڤیتامینـە هــەبێت، نەخۆشیەکانی جگەر و برینی گەدە وپەستانی خوێن و خوێنبەربونی شادەمار.

کاریگەری لاوەکی: ئازاری سەر و هێڵنجدان و ئارەقکردنـەوە و دڵـەکزە و وشـکبوونی قژ.

بڕی دەرمان: منداڵی ٦ مانگ ڕۆژانە ٥ میلی گرام، ٦ مانگ تا ١ساڵ ڕۆژانە ٦ میلـی گرام، ١ ساڵ تا ٣ ساڵ ڕۆژانە ٩ میلی گرام، ٤ ساڵ تا ٦ ساڵ ڕۆژانە ١٢ میلـی گـرام، ٧ ساڵ تا ١٠ ساڵ ڕۆژانە ١٣ میلی گرام. بۆ ڕەگەزی نێر ١١ تا ١٤ ساڵ ڕۆژانـە ١٧ میلـی گرام،١٥ تا ٥٠ ساڵ ڕۆژانە ٢٠ میلی گرام.بۆ ڕەگەزی مێ: ١١ تـا ٥٠ سـاڵ ڕۆژانـە ١٥ میلی گرام.

**ڤیتامین B٥ (پانتۆپینیك ئەسید): Vitamen B٥(Pantothenic Acid)**

شێوەی دەرمان: شروبی ٢ میلی گرام/٤ میلی لیتر، (٢ و٢,٥) میلی گرام/٥ میلی لـیتر و حــەبی (٤،١٠،١٢،٢٣،٢٥) میلــی گــرام، کەپــسولی ٥،١٠ میلــی گــرام، تــۆز (Powder)١٥ میلی لیتر.

گرووپی دەرمان: VITAMINE

بەکارهێنان: بۆکەمی ڤیتامین B و بەدخۆراکی و برین و زیپکە بەکاردەهێنرێت.

بەکارنەهێنان: کاتێك حەساسیەت بەم دەرمانە هەبێت و لەکاتی شێرپەنجە و شـێرپەنجەی خوێن بەکارنایەت.

کاریگەری لاوەکی: خوران، سوربونەوە، سکچون، هێڵنجدان، دڵەکزێ، ڕوشانی پێست و هەڵئاوسانی پێست.

بڕی دەرمان: پەسەندترین بڕی دەرمان ٤ تا ٧ میلی گرام لەڕۆژێکدا.

**ڤیتامین B٦ (پایریدوکسین ®PYRIDOXINE) VITAMIN B٦**

شێوەی دەرمان:حەبی ٢٠ و ٥٠ میلی گرام و دەرزی ١,٥ میلی گرام/١میلی لیتر، ٤ میلی گرام/١میلی لیتر،٥ میلی گرام/١میلی لیتر، ١٠ میلی گرام/١میلی لیتر، ١٠٠ میلی گرام/٣ میلی لیتر و قەترەی ٢ میلی گرام/١میلی لیتر،٠,٥ تا ١ میلی گرام/ ٠,٦ میلی لیتر و شروبی (١،٢،٣،٤،٥،١٠) میلی گرام/٥ میلی لیتر و سەسپێنشنی ٨ میلی گرام/٥ میلی لیتر.

گروپی دەرمان: VITAMINE

بەکارهێنان: بەرگریکردن لە کەمبونی ڤیتامین B٦ و دژی ژەهراویبوون بە ئایزونیازید. بەکاردێت بۆحاڵەتی هێڵنجدان لەماوەی سکپڕیدا.

بەکارنەهێنان: بەکارناهێنرێت بۆ کەسێك کە حەساسیەتی بەم ڤیتامینە هەبێت.

کاریگەری لاوەکی: دابەزینی پلەی گەرمی، هێڵنجدان، سەرئێشە.

بڕی دەرمان: منداڵ ١ تا ٣ ساڵ ٠,٩ میلی گرام،٤ تا ٦ ساڵ ١,٣ میلی گرام، ٧ تا ١٠ ساڵ ١,٦ میلی گرام و گەورەکان پیاو ١,٧ تا ٢ میلی گرام، ژن ١,٤ تا ١,٦ میلی گرام.

## فولیك ئەسید: (VitaminB٩) FOLIC ACID

ناوی بازرگانی: (Lexpec),(Folvite)

شێوەی دەرمان: حەبی ٤٠٠ مایکرۆگرام و ٥ میلی گرامی، دەرزی ١٥ میلی گرام/١ میلی لیتر، شروبی ٤٠٠ مایکرۆگرامی و٢,٥ میلی گرامی/٥ میلی لیتر.

گروپی دەرمان: VITAMINE

بەکار هێنان: بۆ چارەسەری کەمی فۆلیك ئەسید و کەمخوێنی و ناتەواوی ئەعصاب و هەڵسوکەوتی سەیر، ڕێژەی پێوستبون بەئەم ڤیتامینە لەکاتی سکپڕیدا زیاتر دەبێت.

بەکارنەهێنان: لەکاتێك مۆخی ئێسك نەتوانێت خڕۆکەکان دروست بکات.

کاریگەری لاوەکی: خوران، سوربونەوەی پێست، کرژبونی بۆری هەوا.

بڕی دەرمان: بۆ کەمخوێنی گەورە و منداڵی سەرو ١ ساڵ ٥ میلی گرام ڕۆژانە بۆ ٤ مانگ، منداڵی خوار ١ ساڵ ٥٠٠ مایکرۆگرام/ کیلۆگرام، سکپڕ ٥ میلی گرام ڕۆژانە وەربگیردرێت.

**ڤیتامین B١٢ (سیانوکوبالامین): VITAMIN B١٢ (CYANOCOBALAMIN)**

ناوی بازرگانی: (Berubigen) (Berocca PN)، (Cobex)، (Cobolin)، (Cyanoject) (Crystamine)، (Cyomin)، (Depinar)، (Neuroforte).

شێوەی دەرمان: دەرزی ١٠٠ مایکرۆگرام/میلی لیتر و ١٠٠٠ مایکرۆگرام/١ میلی لیتر.

گروپی دەرمان: VITAMINE

بەکارهێنان: دژی کەمخوێنی و کەمی ڤیتامین B١٢ بەکاردێت.

بەکارنەهێنان: بەکارنایەت بۆ کەسێك کەلەزکماکیەوە پوکانەوەی دەماری هەبێت.

کاریگەری لاوەکی: ئازاری سنگ، تا، ئارەقکردنەوە، ئازاری جومگە.

بڕی دەرمان: گەورەکان ٠,١ میلی گرام ڕۆژانە بۆ ماوەی ٧ ڕۆژ، منالان٠,٠٣ تا ٠,٠٥ میلی گرام ڕۆژانە.

**ڤیتامین Cyclobenzaprine hydrochloride:B١٥**

شێوەی دەرمان: حەبی ٥ و ١٠ میلی گرام، کەپسولی ٣٠ و ١٥ میلی گرام.

گروپی دەرمان: VITAMINE

بەکارهێنان:شارەزایانی ڕوسی ڤیتامین B١٥ بۆ چارەسەری گرێ دەرونیەکان و لابردنی ترشی ناوماسولکە (ترشی لاکتیك)، کە دەبێتەهۆی کفتبونی ماسولکە لەکاتی ماندوبوندا بەکاردەهێنن. هەروەها پزیشکە ئەمریکیەکان ڤیتامین B١٥ بۆچارەسەری زمان بەربون لەمنداڵدا بەکاردەهێنن، وە هەروەها پێیان وایە کە بۆ هەستیاربوون بەسودە.

بەکارنەهێنانی: حەساسیەت بەم دەرمانە، شکستی دڵ زۆربونی پایرۆید.

کاریگەری لاوەکی: هێڵنجدان، ڕشانەوە، بورانەوە، دابەزینی پەستانی خوێن، زۆرلێدانی دڵ تەمەڵی، وڕێنە، سەرسوڕان.

بڕی دەرمان:بۆ گەورەکان ٥ تا ١٠میلی گرام ڕۆژی ٣ جار.

**ڤیتامینB کومپلیکس:VITAMINE B COMPLEX**

شێوەی دەرمان: بەشێوەی حەب و دەرزی و شەربەت.

گروپی دەرمان: VITAMINE

بەکارهێنان: وەك مقەوی بەکاردێت، بۆ چارەسەری کەمبونی ڤیتامینەکانی گروپی B و لەگەڵ دەرمانی شێرپەنجە و سیل دەدرێت.

بەکارنەهێنان: بەکارنایەت لەحاڵەتی حەساسیەت بەم دەرمانە.

کاریگەری لاوەکی: خوران، سوربونەوەی پێست، هەڵئاوسانی سیەکان، برینی گەدە، زەردوویی، شینبوونەوە بەهۆی کەمی ئۆکسجین، وشکبوونی پێست، بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، ئارەقکردنەوە.

بڕی دەرمان: ڕۆژانە ١ تا ٣ حەب یان ١ تا ٣ کەوچك شەربەت.

**ڤیتامین (C): (ASCORBIC ACID) VITAMIN C**

ناوی بازرگانی: (Allercorb) (Adenex)، (Antiscorbic Vitamin) (Antiscorbutic)، (Ascorbajen)، (Ascorbicab).

شێوەی دەرمان: حەبی ٢٥ تا ١٠٠٠ میلی گرامی وپاوەدەری ٥٠٠ میلی گرامی و دەرزی ١٠٠ میلی گرام/میلی لیتر (٥ میلی لیتر).

بەکارهێنان: بەکاردێت وەك مقەوی، بەرگریکردن لە کەمبونی ڤیتامین (C)، خوێنبەربوونی پوك و ددانەکان وە خوێنبەربوونی ژێرپێست.

بەکارنەهێنان: وەرنەگرتنی بڕێکی زۆر لەکاتی سکپڕیدا.

کاریگەری لاوەکی: ئازار لەکاتی میز کردندا، بونی خوێن لەمیز، کرژبونی گەدە، سکچون.

بڕی دەرمان: گەورەکان ١٠٠ میلی گرام تا ٢ گرام بە شێوەی دەرزی IVو IM و SC و خۆراکی (دەم) ڕێگەی پێدەدرێت بڕی دەرمانی جێگیر ڕۆژانە ٥٠ میلی گرامە، منالان ١٠٠ میلی گرام تا ٣٠٠ میلی گرام بە شێوەی IV و IM و SC و خۆراکی

(دەم) ڕێگەی پێدەدرێت بڕی دەرمانی جێگیر ڕۆژانە ٣٥ میلی گرامە، شیرخۆران ٥٠ میلی گرام تا ١٠٠ میلی گرام بەشێوەی IV و IM و SC و خۆراکی (دەم) ڕێگەی پێ دەدرێت.

**ڤیتامین D: VITAMINE – D**

شێوەی دەرمان: حەب و شەربەت.

گرووپی دەرمان: VITAMINE

بەکارهێنان: بۆ چارەسەری کەمی کالیسیۆم، دژی دەردەکۆپان، کەمی کاری پاراپایرۆید، نارێکی و ناتەواوی گورچیلە.

بەکارنەهێنان: بەکارنایەت لەحاڵەتی زۆربوونی کالیسیۆم دا.

کاریگەری لاوەکی: زۆربونی میز، کەمبونەوەی کێش، ئازاری سنگ، ئارەزوونەکردنی خۆراك، هێڵنجدان، توونیەتیەکی زۆر.

بڕی دەرمان: ڕۆژانە ٠,٥ تا ٢ میلی گرام.

**ڤیتامین D٢ (ئێرگۆکالسیفیرۆل): VITAMINE D٢ (Ergocalciferol)**

ناوی بازرگانی: (Calciferol )، (Calciferon ٢) ، (Condacaps )، (Condocaps)، (Condol).

شێوەی دەرمان: کەپسولی ٥٠٠٠٠ یەکەی (١,٢٥میلی گرام)، دەرزی ٥٠٠٠٠٠ یەکەی/میلی لیتر (١٢,٥ میلی گرام/میلی لیتر)، حەبی ٥٠٠٠٠ یەکەی (١,٢٥ میلی گرام).

گرووپی دەرمان: VITAMINE

بەکاردێت بۆ کەمی ڤیتامین D و کەمی کالیسیۆم و کەمبونەوەی پاراپایرۆیدەکان و پوکانەوەی ئێسك و نارێکی گورچیلە، زیندەچالاککردنی مۆخی ئێسك.

بەکارنەهێنان: بەکارنایەت لەحاڵەتی زۆربوونی کالیسیۆم، کەمبونەوەی ئێشی گورچیلە.

کاریگەری لاوەکی: دەبێتەهۆی نارێکی لێدانی دڵ لاوازبوونی گورچیلە، سەرئێشە، کەمبوونەوەی کێش، ڕشانەوە، هێڵنجدان، زۆر میزکردن، تینوێتی، ئیفلیجی، بێهەستبوون، خەوبردنەوە.

بڕی دەرمان: بۆپێویستبون بەڤیتامین دی مندالْ ٧٥ تا ١٢٥مایکرۆگرام ڕۆژانە، گەورەکان ٢٥٠ مایکرۆگرام تا ١,٥ میلی گرام ڕۆژانە.

بۆ شکستی گورچیلە مندالْ ١٠٠ تا ١٠٠٠ مایکرۆگرام ڕۆژانە، گەورەکان ٥٠٠ مایکرۆگرام ڕۆژانە.

بۆ کەمبونەوەی پاراپایرۆید لە مندالْ ١,٢٥ تا ٥ میلی گرام ڕۆژانە، گەورەکان ٦٢٥ مایکرۆگرام تا ٥ میلی گرام ڕۆژانە.

ئێسکەنەرمە بۆ مندالْ و گەورە ٢٥ تا ١٢٥مایکرۆگرام ڕۆژانە.

**ئەلفاکالسیدۆل: Alfacalcidol(Hydroxycholecalciferol)**

ناوی بازرگانی: (One Alpha) ، (Alsiodol)

شێوەی دەرمان: دەرزی (٠,٥ و ٢) مایکرۆگرام/١ میلی لیتر، قەترە (٠,٢) مایکرۆگرام/١ میلی لیتر، حەب و کەپسول ( ٠,٢٥ و ٠,٥ و ١) مایکرۆگرام، شروب (٠,٥) مایکرۆگرام/٥ میلی لیتر.

گروپی دەرمان: VITAMINE

بەکارهێنان: کەمبوونەوەی کالیسیۆم و ئێسکەنەرمە وپوکانەوەی ئێسك و کەمبوونەوەی فۆسفات و نەخۆشی ئێسکی پاراپایرۆید و لاوازبوونی گورچیلە.

بەکارنەهێنان: بەکارنایەت لەحالەتی زۆربوونی کالیسیۆمدا.

کاریگەری لاوەکی: سکچون، ڕشانەوە، هێڵنجدان، زۆربوونی میز، ئارەقکردنەوە، سەرگێژبوون، تینویەتی، بوورانەوە، کپکردنیCNS.

بڕی دەرمان: لەمندالدا ٠,٠٥ مایکرۆگرام لەڕۆژێکدا، لەگەورەدا ٠,٢٥ تا ١ مایکرۆگرام لەڕۆژێکدا.

**کالسیتریۆل: Calcitrol (Dihydroxycholecalciferol)**

ناوی بازرگانی: Calcijex، Rocaltrol

شێوەی دەرمان: کەپسولی ٠,٥ و ٠,٢٥ مایکرۆگرام، دەرزی ( ١ تا ٢) مایکرۆگرام /١ میلی لیتر، گیراوە ١ مایکرۆگرام/١ میلی لیتر.

گروپی دەرمان: VITAMINE

بەکارهێنان: کەمبونی ڤیتامین D و بەرزکەرەوەی کالسیۆمی خوێن دژی نەرمی ئێسقان و پوکانەوەی ئێسك و ناتەواوی کاری گورچیلە و بۆسۆریاسس بەکاردێت.

بەکارنەهێنان: بەکارنایەت لەحاڵەتی زۆربوونی کالیسیۆمدا.

کاریگەری لاوەکی: زۆربـوونی میـز، کەمبونـەوەی کـێش، ئارەزونـەکردنی خـۆراك، هێڵنجدان، توونیەتیەکی زۆر.

بڕی دەرمـان: لەمنداڵـدا کەپـسول و گیراوەکـە ٠,٢٥ تـا ٢ مـایکرۆگرام لەڕۆژێکـدا، بەشێوەی دەرزی بۆ هەرکیلۆ گرامێك ٠,٠١ تا ٠,٠٥ مایکرۆگرام ڕۆژی ٣ جار.

لەگەورەکاندا کەپـسول و گـیراوە (٠,٢٥ مـایکرۆگرام) لەڕۆژێکـدا، بەشـێوەی دەرزی (٠,٥ مایکرۆگرام) ڕۆژی ٣ جار.

## ڤیتامین D٣: (COLECALCIFEROL) VITAMINE D٣

نـــاوی بازرگـــانی: (Oleovitamin D٣)، (Provitamin D٣) (Provitamine)

شێوەی دەرمان: دەرزی ٥ میلی گرام/میلی لـیتر و کەپـسولی ٣٠٠ یەکـەیی و حـەبی ٢٠٠، ١٠٠٠ یەکەیی.

گرووپی دەرمان: VITAMINE

بەکارهێنان: دژی کەمبونی کالسیۆمە و بەکاردێت بۆ بەرزکردنەوەی کالسیۆمی خـوێن و بـەرگری لـە کـەمبونی ڤیتـامین D، کەمبوونـەوەی پاراپایرۆیـد و بـۆ چارەسـەرکردنی سۆریاسس بەکاردەهێنرێت.

بەکارنەهێنان: بەکارنایەت لەحاڵـەتی زۆربـوونی کالیـسیۆم دا،کاتێـك حەساسـیەت بـەم دەرمانە هەبێت.

کاریگەری لاوەکی: تەشەنوج، نەمانی ئارەزوی خواردن، هێڵنجدان، خوران، گێـژبوون، سەرئێشە.

بڕی دەرمان: گەورەکان ٤٠٠ تـا ١٠٠٠ یەکـە ڕۆژانـە. منـاڵان ١ تـا ٥ مـایکرۆگرام ڕۆژانە بۆ ماوەی ٤ ڕۆژ.

## دای هایدرۆتاکیستیرۆڵ: Dihydrotachysterol

نــاوی بازرگـــانی: (Dichystrolum)، (Dihydral)، (Dygratyl)، (Hytakerol)، (Parterol).

شێوەی دەرمان: کەپسولی ٠,١٢٥ میلی گرام، گیراوەی خواردنـەوە لـەناو چـەوری ( ١٥ میلی لیتر) و ٠,٢٥ میلی گرام/١ میلـی لـیتر، حـەبی (٠,١٢٥ و ٠,٢ و ٠,٤ ) مایکرۆگرام.

گرووپی دەرمان: VITAMINE

بەکارهێنان: کەمی کالیسیۆم و دەردەکۆپان و کەمبوونـەوەی پاراپایرۆیـد و کەمبونـەوەی فۆسفات،لاوازی گورچیلە.

بەکارنەهێنان: بەکارنایەت لـەحاڵـەتی زۆربـوونی کالیـسیۆم دا،کاتێـك حەساسـیەت بـەم دەرمانە هەبێت.

کاریگـەری لاوەکـی:سکـچون، ڕشـانەوە، هێڵنجـدان، زۆربـوونی میـز، ئارەقکردنـەوە، سەرگێژبوون، تینویەتی، ئازاری ئێسك.

بڕی دەرمان: لـەگەورەکاندا بۆ کەمی کالیسیۆم، کەمبونەوەی پاراپایرۆیـد، کەمبونـەوەی فۆسفات ٠,٢٥ تا ٠,٨ میلی گرام ڕۆژانە بۆ ٤ ڕۆژ بەکاردێت، بۆ نێسکەنەرمە ٠,٦ میلی گرام ڕۆژانە، بۆ لاوازی گورچیلـە ٠,١ تا ٠,٦ میلی گرام ڕۆژانە.

لـەساواکاندا بۆ کەمی پاراپایرۆید ٠,٠٥ تا ٠,١ میلی گرام ڕۆژانە، منداڵ ١ تـا ٥ میلـی گرام ڕۆژانە بۆ ٤ ڕۆژ، بۆ لاوازی گورچیلـە ٠,١ تا ٠,٥ میلی گرام ڕۆژانە.

## پاریکالسیتۆڵ: Paricalcitol

ناوی بازرگانی: Zemplar

شێوەی دەرمان: دەرزی ٠,٢٥ مایکرۆگرام/١ میلی لیتر ( ١،٢،٥ میلی لیتر).

گرووپی دەرمان: VITAMINE

بەکارهێنان: کەمبوونەوەی پاراپایرۆیدی دووەمی ولاوازی گورچیلـە.

بەکارنەهێـنان: بەکارنایەت بۆ کەسێك حەسـاسیەتی هەبێت بەم دەرمانە و ژەهـراوی بـوبێ بە ڤیتامین D و زۆربوونی کالیسیۆم.

کاریگەری لاوەکی: تۆپەڵبوونی خوێن و هەڵئاوسان و هێڵنجدان و ڕشانەوە و زۆرلێدانی دڵ.

بڕی دەرمان: لەگەورەکاندا (٠,٠٤ تا ٠,١) مایکرۆگرام/کیلۆگرام.

**ڤیتامین (E): (ALPHATOCOFEROL) VITAMIN - E**

ناوی بازرگانی: (Evital)، (Ephynal)،(Evian)، (Aquasol E)، (Daltose)

شێوەی دەرمان: حەبی ٢٠٠ و ٤٠٠ یەکەیی، دەرزی ١٠٠ یەکەی/میلی لیتر و قەترەی خۆراکی ٥٠ یەکەیی و کەپسولی ١٠٠، ٢٠٠، ٣٣٠، ٤٠٠، ٥٠٠، ٦٠٠، ١٠٠٠ یەکەی و کرێمی ٥٠ میلی گرام/١٥، ٣٠، ٤٥ گرام و لۆشنی ١٢٠ میلی لیتر و مەڵهەمی ٣٠ میلی گرام/٤٥، ٦٠ گرام.

بەکارهێنان: بەرگری لە کەمبونی ڤیتامین (E) بۆ نەزۆکی و کەمخوێنی و لەبارچون و سوتانەوە و لاوازی و بێهێزی و بێ توانایی.لەلێکۆڵینەوە دەرکەوتووە کەزۆربوونی ئەم ڤیتامینە دەبێتە هۆی درێژی تەمەن.

بەکارنەهێنان: بەکارنایەت ئەگەر حەساسیەت بەم دەرمانە هەبێت.

کاریگەری لاوەکی: تێکچونی بینین، کرژبونی گەدە، سکچون.

بڕی دەرمان: گەورەکان ڕۆژانە ٦٠ تا ٧٥ یەکە خۆراکی یان ماسولکەیی IM، منالان ڕۆژانە ١٠ یەکە/کیلۆگرام خۆراکی یان IM، شیرخۆران ١٥ تا ٢٥ یەکە ڕۆژانە ڕێی پێ دەدرێت.

**ڤیتامین (H)بیوتین: (Biotin) VITAMIN - H**

ناوی بازرگانی: Meribin، Biotin Forte

شێوەی دەرمان: شەرابی (٢،٢٥،٦٠٠،٣٠٠) مایکرۆگرام/٥ میلی لیتر. حەبی (١٥،٣٠،٤٥،٢٥٠،٣٠٠) مایکرۆگرام، (٠,١و ٠,٢ و٠,١٥ ) میلی گرام و کەپسولی (٠,٢) میلی گرام و (٤٥،٥٠،٥،٠,٥) مایکرۆگرام.

بەکارهێنان: بۆ چارەسەری کەمبونی ئەم ڤیتامینە، کەمبوونی ئەم ڤیتامینە دەبێتە هۆی وشکی پێست و ڕوتانەوەی قژ.

بەکارنەهێنان: بەکارنایەت لەحاڵەتی حەساسیەت بەم ڤیتامینە.

کاریگەری لاوەکی: هیچ داتایەك لەبەردەست نیە بۆ بوونی کاریگەری لاوەکی.

بڕی دەرمان: ڕێژەی پێوستی ئەم ڤیتامینە ٣٠ تا ١٠٠ مایکرۆگرامە لەڕۆژێکدا. لەمنداڵدا بۆ هەرکیلۆیەك ٤ مایکرۆگرامە، لە گەورەکاندا (١٠ تا ٢٠٠) مایکرۆگرام لەڕۆژێکدا.

**ڤیتامین (K١): (PHYTOMENADIONE) VITAMINE K١**

ناوی بازرگانی: (Konakion),(mephyton)

شێوەی دەرمان: دەرزی ٢ میلی گرام/میلی لیتر (٠,٥ میلی لیتر) و گیراوەی دەرزی ١٠ میلی گرامی و حەبی ٥ و ١٠ میلی گرامی.

بەکارهێنان: وەستێنەرەوەی خوێنە و دژی خوێنبەربوون و تێکچونەکانی جگەری و هەرس و هەزم بەکاردێت.

بەکارنەهێنان: بەکارناهێنرێت بۆ کەسێك کە حەساسیەتی بەم ڤیتامینە هەبێت.

کاریگەری لاوەکی: سەرئێشە، خوران، هێڵنجدان، ڕشانەوە، نارێکی لێدانی دڵ.

بڕی دەرمان: ڕۆژی ١ تا ٢ حەب بەکاربهێنرێت، ساواکان ٠,٥ تا ١ میلی گرامIM یان SC، بەبێ بونی ماوە دوای لەدایکبوون ڕێی پێ دەدرێت. ئەگەر پێویست بێت ئەم بڕە هەر ٦ تا ٨ سەعات جارێك دوبارەدەکرێتەوە. بۆ کەمبونی ڤیتامین K گەورەکان ٥ تا ١٠ میلی گرام IM یان SC هەفتەی ١ جار. منالان ٢ تا ٥ میلی گرام IM یان SC هەفتەی ١ جار.

**میناديۆن: (VITAMINE K٣) Menadiol sodium phosphate**

ناوی بازرگانی: (Klottone)، (Kolklot)، (Panosine)، (Synkavite)

شێوەی دەرمان:.حەبی ١٠ میلی گرام.

بەکارهێنان: وەستێنەرەوەی خوێنە و دژی خوێنبەربوون و بۆ ڕەقکردنی ئێسك بەکاردێت.

بەکارنەهێنان: بەکارنایەت بۆ شیرەخۆر و سکپڕ.

کاریگەری لاوەکی: لاوازبوونی جگەر، کەمبونەوەی گلیسیرین، توشبوون بە بۆگەنبوونی خوێن (sepsis).

بڕی دەرمان: دەبێت ڕۆژانە ١٠ تا ٤٠ میلی گرام وەربگیرێت.

**ڤیتامین (K٤): VITAMINE K٤**

**شێوەی دەرمان:** بەشێوەی دەرزی هەیە.

**بەکارهێنان:** دژی خوێنبەربوون و تێکچونەکانی جگەر.

**بڕی دەرمان:** ڕۆژانە ٥ تا ١٠ میلی گرام IM و IV.

**ڤیتامین پی: Rutin (Vitamin P)**

**شێوەی دەرمان:** حەبی ٥٠ و ١٠٠ میلی گرامی و کەپسولی ٢٠ میلی گرامی.

**بەکارهێنان:** بۆ مایەسیری و بەنجی نەشتەرگەری و نیشانەکانی زۆلینجەر ئیلیسۆن (Zollinger-ellison syndrome).

**بەکارنەهێنان:** بەکارنایەت کاتێك حەساسیەت بەم دەرمانە هەبێت.

**کاریگەری لاوەکی:** ڕشانەوە، هێڵنجدان، سەرسوڕان، سکچون یان قەبزی، وشکبونی دەم.

**بڕی دەرمان:** دەبێت ١ تا ٢ گرام ڕۆژانە وەربگیردرێت.

لە خوارەوە بە ڕوونکراوەیی ڤیتامینەکان، ڕۆڵ و ئەرکەکانیان لە لەشدا و نیشانەکانی کەمبوونیان لە فسیۆلۆجی لەشدا دەخەینەڕوو:

**ڤیتامینA**

**سودەکانی:** گونجاندنی بینایی لە تاریکیدا، سەلامەتی پێست و لینجە پەردە، دابینکردنی نەش و نمای منداڵان، توانای بینایی لە ڕوناکی کەم، پێکهێنەری ئێسك، دروستبوونی وەکو گەشە و ئامادەکردنی مەوادی میوکوپۆلی سەکەراید.

**نیشانەکانی کەمبوونی:** شەوکوێری، وشکی چاو، وشکی پێست، گۆڕانی شێوەی ئێسك، کەمبوونەوەی مقاوەمەت سەبارەت بە هەوکردن.

**بڕی بەکارهێنان:** گەورەکان ١٢٠٠ تا ١٠٠٠ مایکرۆگرەم، بڕی بەکارهێنانی ئافرەتانی سکپڕ و شیردەر ١٣٠٠ تا ١٢٠٠ مایکرۆگرەمە.

**سەرچاوەی سەرەکی ڤیتامین A:** جگەر، کەرە، زەردێنەی هێلکەی مریشك، شیری دەوڵەمەندکراو، ڕۆنی ماسی، گێزەر، کولەکەی حەڵوایی، سەوزەواتە بەرگدارەکان.

**تێبینییەکان:**

١- سەوزەواتی نارنجی، وەك گێزەر، كولەكەی تەمەڵ و كولەكەی زستانی پڕ لە ڤیتامین A ین.

٢-مادەی پرۆڤیتامین (پرۆڤیتامین -ئەی) بێتاكارۆتین لە سەوزییە سەوز و زەردەكاندا، گێزەر، ئاوی تەماتە، قەیسی، كاڵەك و سەوزییە ڕەنگییەكان بەدەست دێت.

٣- ڤیتامین A بەشێوەی دیتیناڵ لە چالاكی شەبەكەی چاو ڕۆڵی سەرەكی هەیە.

٤- ڤیتامین A بە ئاسانی لە دەزگای هەرس دەمژرێت.

٥- بەكارهێنانی زیادی ڤیتامین A ژەهراویبوونی لەگەڵە.

٦- نیشانەكانی ژەهراویبوون: هیلاكی، بێ ئیشتیهایی، هەستیاربوون بە ڕوناكی، وەرینی موو و..ە.

٧- كەمبوونی توندی ڤیتامین A زیان بە كۆرنیەی چاو دەگەیەنێت.

٨- لەكاتی بوونی نەخۆشی هیپاتیت (ئیلتیهابی جگەر) مژینی ڤیتامین A تێك دەچێت.

٩- پاش لە میتابۆلیزمی(زیندەچالاكی) ڤیتامینA لە ڕێگەی جگەر و گورچیلەوە دەكرێتە دەرەوە.

ڤیتامین D

سودەكانی: ئاسانكاری مژینی ڕیخۆڵەیی بۆ كالسیۆم، جوڵە و گواستنەوەی كالسیۆم لەئێسك، پاراستنی فۆسفۆری لەش، تۆكماندنی ترشی ستریك لە لەشدا، بەهێزكەری سەرەكی ئێسكە.

نیشانەكانی كەمبوونی: نەرمی ئێسك كە هۆی دروستبوونی نەخۆشی ڕكتز (كەمبوونی ڤیتامین دی) و ئۆستیۆمالاسیا (ئێسكە نەرمە) دەبێت. كێشە لە ڕێ ڕۆیشتندا، پێی كەوانەیی و لادان لە ئێسكەكاندا.

بڕی بەكارهێنان: گەورەكان ٤٠٠ یەكە، ئافرەتە سكپڕ و شیردەرەكان ٤٠٠ یەكە.

سەرچاوەی سەرەكی: ١- ڕوناكی خۆر لە لەشی مرۆڤ بە كاركردنە سەر ڕووی پێست.

مەودای خۆراكی: زەردێنەی هێلكە، ماسی سەلەمۆن، ڕۆنی ماسی.

تێبینییەكان:

١- لە بەركەوتنی ڕاستەوخۆی ڕوناكی خۆر بۆ سەر ڕووی پێست لە لەشدا دروست دەبێت.

٢- ئەم بەرکەوتنی ڕوناکی خۆرە نابێت لە پشت شوشەوە بێت.

٣- لە بەساڵاچووواندا کەمبوونی تونـدی ڤیتـامین D، دەبێتـەهۆی ئۆستیۆپۆرۆسـس (پوکانەوەی ئێسك).

٤- کاریگەرییەکانی دەرمان یان ژەهراویبـوونی تونـد بـە ڤیتـامین D ئەمانـە دەگرێتـەوە: سەرئێشە، خەواڵویی، بێهێـزی، هێڵنجـدان، ڕشـانەوە، وشـکی دەم و قـەبزی، ئـازاری ماسولکەیی، هەستکردن بە تامی کانزایی ناو دەم.

نیشانەکانی ژەهراویبوون بە ڤیتامین دی: زۆرمیزکردن، زۆرئاوخواردنەوە، بێ ئیـشتهایی و مژینی کالسیۆم لە دەمارەکاندا.

ڤیتامین E

سودەکانی: چالاکی دژە ئۆکساندنی هەیە، سینسز (دروستکردن) خانەیی، کاریگەری لـە خانەهەناسەدا.

نیشانەکانی کەمبوونی: لە نەخۆشییەکانی کۆئەندامی هەرس و خراپبوونی خانەی دەمـاری و خوێنی دەردەکەوێت. هەندێك جار هۆی کەمخوێنی (ئەنیمیا) دەبێت.

بـڕی بـەکارهێنان: گـەورەکان ١٠ مـایکرۆگرەم ئافرەتـانی سـکپڕ و شـیردەر ١٢ مایکرۆگرەم.

سەرچاوەی سەرەکی: هێلکە، ماسی، شیرەمەنییەکان، سەوزەواتەکان، غـلات، میوەکـان، ڕۆنەکانی گیایی و چەکەرەی گەنم.

تێبینییەکان:

١-هۆی زیادکردنی چالاکی ڤیتامین ئەی دەبێت.

٢-هەرچەندە مادەی بنەڕەتییە لە خۆراکدا، بەڵام ڕۆڵە سەرەکییەکەی دیاری نەکراوە.

٣- بەرگری لە لەنێوچوونی خڕۆکەی سوری خوێن (RBC) لە ئەرکـەکانی ڤیتـامین E یە.

٤- ئەم ڤیتامینە لە چەوریدا تواوەیە و پێویستی بە چالاکی ڕاستی کیسەی زراو هەیە.

٥- لە ژەهراویبوونی توند، نیشانەکانی هەرسی وەك: ئـازاری دڵ سکـچون و بێهێـزی و هیلاکی دەردەکەوێت.

ڤیتامین B

گروپی ڤیتامینەکانی B۱ بۆ B۱۲ بەلایەنی تێروانینی پزیشکەکان دانراوە.

خشتەی سەرچاوە سەرەکییەکان و بڕی بەکارهێنان و کاریگەرییەکان بەهۆی ئەم ڤیتامینەوە بە ڕونکردنەوەی ئەمانەی لای خوارەوەیە.

ڤیتامین B۱: بۆ زیندەچالاکی مەوادی شەکری و نیشاستەی پێویست و لە خومرەی ئاوجۆ (جۆرێکی قارچکی تاك خانەیە) بە فراوانی دەبینرێت و کەمبوونی ئەم ڤیتامینە بە هیلاکی و تورەییدا دەردەکەوێت.

ڤیتامین B۲: کەمبوونی ئەم ڤیتامینە بە ترەکینی گۆشەی لێو و ترس لە ڕوناکی (فۆتۆفۆبیا) و کێشەی چاوی دەردەکەوێت و لە شیر و ماست و ماستاو و پەنیر دەبینرێت.

ڤیتامین B٦: ڕۆڵی لە زیندەچالاکی مەوادی پرۆتینیدا هەیە. لە گۆشت و سەوزەوات بە فراوانی دەبینرێت. دەرمانی ئەم ڤیتامینە کاریگەری دژی هێڵنجدانیشی هەیە. هەر لەبەرئەمەیە هەندێك جار بۆ چارەسەری ڕشانەوە بەکاردێت.

ڤیتامین B۱۱: فۆلیك ئەسید یان ڤیتامین B۱۱ ڕۆڵی هەیە لە دروستکردنی خوێن و بەرگریکردن لە کەمخوێنی (ئەنیمیا) بەتایبەت لە سکپڕیدا.

<table>
<tr><td>B۱۲</td><td>شیر، هێلکە، گۆشتی سور و ماسی</td><td>۲ مایکرۆگرەم</td><td>تێکچونی دەماری، کەمخوێنی و تێکچونی هەڵسوکەوت</td></tr>
<tr><td>ڤیتامین</td><td>سەرچاوەی سەرەکی</td><td>بڕی پێویست</td><td>نیشانەکانی تەندروستی بەهۆی کەمبوونی</td></tr>
<tr><td>B۱</td><td>سەوزی، غلات، لۆبیا شیر و گۆشت</td><td>۱/٥ تا ۱/۲ مایکرۆگرەم</td><td>نەخۆشی بەربەری، بێهێزی، هیلاکی، بێ ئیشتیهایی، قەبزی، خەمۆکی و کێشەی حافزە</td></tr>
<tr><td>B۲</td><td>شیرەمەنییەکان، هێلکە، گۆشتی سور و سەوزی</td><td>۱/۸ تا ۱/٥ مایکرۆگرەم</td><td>ئازاری گەروو، ئیلتیهابی دەم و چاو، لێو و زمان</td></tr>
<tr><td>B٦</td><td>غلاتی تەواو، میوە، سەوزی، هێلکە، گۆشتی سوری باڵندەکان</td><td>۲ تا ۱/۷ مایکرۆگرەم</td><td>تەشەنوج لە مەحرومیەتی تەواو لە ساوایان</td></tr>
<tr><td>B۱۱</td><td>پۆلکە، پرتەقاڵ، پۆلکەی فەرهەنگی، سەوزی، غلات</td><td>۲۰۰ مایکرۆگرەم</td><td>کەمخوێنی، تێکچونی ڕەفتاری</td></tr>
</table>

ڤیتامین B۱۲: بە پێچەوانەی باقی گروپەکانی B لە سەوزەوات و میوەدا نابینرێت، لە جیاتی ئەوە لە گۆشت، جگەری ڕەش و گورچیلەدا بەزۆری هەیە.

**ڤیتامین C:**

سودەکانی: دروستکردنی شانەی مینایی ددان، چاکردنەوەی برین، بەهێزکردنی کاریگەری ئاسن و فۆلیك ئەسید، دروستکردنی کۆلاجینی ئێسکی و ڕۆڵی گرنگی لە هەناسەدانی خانەیی دا هەیە.

نیشانەکانی کەمبوون: نەخۆشی ئیسکۆرۆی، خوێنبەربوونی نائاسایی، نەخۆشی ددانی، بێهێزی گشتی.

بڕی بەکارهێنان: ٦٠ میلی گرەم.

سەرچاوەی سەرەکی: میوە، ئاوێتەکان، ئاوی کیوی، شلیك (تووە فەرهەنگی)، کاڵەك، گوڵی کەلەرم (برۆکلی)، بیبەر، ئاوەتەماتە، پەتاتە بە پێستەوە، کاهو، سپێناخ.

تێبینییەکان:

١-لە بەکارهێنانی ماوە درێژی ئەم ڤیتامینە لە نەخۆشانی دایەبیتی شەکری (نەخۆشی شەکرە) و نەخۆشەکانی گورچیلەیی دووربکەونەوە.

٢- لە نەخۆشی کەمبوونی ئەنزیمی (G٦PD) (فاویسم) هۆی دەرکەوتنی کاریگەرییەکان دەبێت.

٣- کاریگەرییە سەرەکییەکانی دەرزی یان بەکارهێنانی ئەم ڤیتامینە بەشێوەی سەرگێژبوون، بێهێزی گشتی، سکچون، مژینی بەشێوەی بەردی میزەڕۆی ئۆگزالاتی لە گورچیلە دەردەکەوێت.

٤- ڤیتامین C لە شیری دایك بەڕادەیەکی تەواو هەیە.

ڤیتامین بی١٢

سودەکانی: ڕۆڵی سەرەکی ئەم ڤیتامینە بەرگری لە خوێنبەربوون و دروستبوونی کلۆی خوێنە.

نیشانەکانی کەمبوونی: خوێنبەربوون لە پوك و کێشەی مەیینی خوێن.

برِی بەکارهێنان: لە گەورەکان ٨٠ مایکرۆگرەم، لە ئافرەتانی سکپڕ و شیردەر ٨٠ مایکرۆگرەم.

سەرچاوەی سەرەکی: سەوزە سەوزەکان و گەڵادارەکان.

سویا، هێلکە، شیرەمەنییەکان، میوەکان، غلات، جگەری رِەش، زەردێنەی هێلکە.

تێبینییەکان:

١–فاکتەری بنەرِەتییە لە دروسکردنی مەوادی مەیینی خوێندا.

٢– لە چالاکی پرۆتینەکانی ئێسکیدا کاریگەرە. (ئۆستیۆکالسین).

٣– ئەم ڤیتامینە دروستکردنی پرۆترۆمبین (لە هۆکارەکانی مەیینی خوێن) لە جگەردا خێراتر دەکات.

٤– سەرگێژبوون و هاندانی هاوشێوەی تەشەنوج و دابەزینی پەستانی خوێن لە کاریگەرییەکانی ئەو دەرمانانەیە کە ڤیتامین K تێدایە.

٥– بەکارهێنانی زیادی ئەم ڤیتامینە هۆی کاریگەرییە دەرمانیەکان دەبێت لە جگەردا.

مەوادی کانزایی:

ئەو ئەلیکترۆلیتانەی کە مەوادی کانزایی وەك کالسیۆم، فۆسفۆر، صۆدیۆم، پۆتاسیۆم، مس، مەنگەنیز، ئاسن، زینك، مس و فلۆر و یۆد دەگرێتەوە، رِۆڵی زۆر گرنگیان لە چالاکی لەش، لە دروستکردنی ئەنزیمەکاندا هەیە و کە بەکورتی کاریگەرییەکانیان لە خوارەوە دەخەینەرِوو:

| مادەی کانزایی | پێویستی رۆژانەی باڵغبووان | رۆڵی سەرەکی لە لەش | نیشانەکانی کەمبوون | نیشانەکانی زیادبوون | سەرچاوەی خۆراکی |
|---|---|---|---|---|---|
| ئاسن Fe | گەورەکان ١٠ ملی گرم<br>شیردەر<br>٢٠ ملی گرم | کارگەری دروستکردنی خرۆکەی سورِی خوێن، گواستنەوەی ئۆکسجین لە لەشدا، کردنە دەرەوەی مەوادە زیادەکانی خانەکان | کەمخوێنی، بێهێزی، بێ ئیشتیهایی، بێ تاقەتی و بێ ئەحمولی و تێکچوونی هەناسەدان. | مژینی ئاسن لە جگەردا، تێکچوونی کاری دڵ نەخۆشی شەکرە. | جگەر، گۆشت، هێلکە، سویا، کشمش، غلات، سەوزەوات، هەنجیر |
| مس Cu | ٢ ملی گرم | دروستکردنی زەمینەیەکی لەبارِی بۆ مژینی ئاسن، گەشە و | کەمخوێنی لە مندالانی تازەبودا، سکچون، دواکەوتنی | مژین لە جگەردا، تێکچوونی مێشکی، تێکچوونی گورچیلە | جگەر، ماسی، سەوزەوات، گۆشت، کاکاو، غلات، خۆراکی |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | پاراستنی پەرەکانی خوێن و خڕۆکەی سوور و هیمۆگلۆبین | ژیری، شکان و تێکچوونی موەکان، گۆڕانی شێوەی ئێسک، کێشەکانی دەماری. | | وشك |
| مەنگەنیزMn | ٥-٣ ملی گرم | گواستنەوەی ترشی لەمبی، سەرچاوەی دروستکردنی لەنزیمی. | تێکچوونی ڕژێنی سێکسی، لووزەیی و نائاسایی ئێسکی لە حەیوانانا باسی لێوە کراوە. | ئەنێزی گشتی و کێشە لە مێژینی ئاسندا و تێکچوونی دەروونی | گۆشت، ماسی، دانەوێڵەکان، برنج، چای، سەوزەوات |
| زینك Zn | ١٥ ملی گرم | چاککردنەوەی برین، کردنە دەرەوەی مەوادی زیادە لە لەشدا، یارمەتیدانی دەزگای هەرس، زیندەچالاکی پرۆتین. | تێکچوون لە گەشەدا، تێکچوونی جگەری، کێشە لە چاکبوونەوەی برینا، | سکچوون | گوێز، سەوزەوات، دانەی غەلات، مەوادی خۆراکی، دەریایی |
| کالسیۆم | گەورەکان ١٢٠٠ - ٨٠٠ ملی گرم شیردەر ١٢٠٠ ملی گرم | کارگەیە لە دروستکردنی ئێسکدا، کاریگەری لەسەر چالاکی ماسولکەکان بە تایبەت دڵ و ماسولکەکانی ئێسکەپەیکەر | | | شیر، شیر، پەنیر، هێلکە، ماسی، غەلات، گۆشتی سوور، تەرکیبەکانی پرتەقاڵ |
| فۆسفۆر | ١٢٠٠ - ٨٠٠ ملی گرم | | | | شیر، گۆشتی سوور، هێلکە، غەلات، گوێز. |
| سیلینیۆم | ٠,٠٨ ملی گرم | بەرگری لە کلۆبوونی خوێن و خانەکانی خوێنی (خڕۆکەی سوور). بەهێزی کاریگەری ڤیتامین ئی و جێگیرکردنی پەردەی خانەیی | لە مرۆڤدا بوارەکانی کەمبوونی نەبینراوە، لە لایەنەکانی حەیوانی (فحصی) هۆی تێکچوون دەبێت لە گەشەکەیدا. | ناڕەحەتی هەرسی، هاندانی دەزگای هەرس | غەلات، خۆراکەکانی دەریایی، گۆشت، سەوزەواتەکان |

| مۆلیبدیۆم | ٠,٤ ملی گرم | بەهێزکردنی چالاکی هەندێ لە ئەنزیمەکان بەرگری لە خراپبوونی ددان | گۆڕانی شێوەی ئیسك | بەهێزکردن | |
|---|---|---|---|---|---|
| فلۆر (فلۆراید) | ٢ ملی گرم | بەرگری لە پوکانەوەی ئێسکەکان و پوکانەوەی ددان | پوکانەوەی ددان | پەڵەی سپی ددانی، گەورەبوونی نەشیاوی ددان. | ئاوی خواردنەوەی دەوڵەمەندکراو، ماسی، چایی، سۆیا، قاوە، پەنیر، گۆشت. |
| کۆباڵت | وەکو ڤیتامین بی١٢ | سەرچاوەی دروستکردنی ڤیتامین بی١٢ یە. ڕێکخستنی خەستی خوێن. یارمەتیدانی مژینی ئاسن. | ئەگەری کەمخوێنی هەیە. | گواتر (گەورەبوونی ڕژێنی دەرەقی). زیادبوونی خڕۆکەی سوور. ناڕەحەتی پێستی | جگەر، گورچیلە، شیر، گۆشت. |
| یۆد | ٠,١٤ ملی گرم | سەرچاوەی دروستکردنی هۆرمۆنی ڕژێنی تایرۆید، کۆنترۆڵکردنی زیندەچالاکی خانەیی و گەشە و کامڵبوون | گەورەبوونی ڕژێنی دەرەقی، گڕبوونی دەنگ. | گەورەبوونی ڕژێنی تایرۆید، ئارەقکردنەوەی زۆر، لاوازی و دڵەراوکێ و ترس، لەرزینی دەست، تورەیی. | سەموادی خۆراکی، دەریایی، خوێی یۆددار، شیر. |
| کرۆم | ٠,٠٨ ملی گرم | لە زیندەچالاکی شەکری گلوکۆز و دابینکردنی وزەی کاریگەرە. پاراستنی چالاکی هۆرمۆنی ئەنسولین بۆ ڕێکخستنی شەکری خوێن. | تێکچوون لە زیندەچالاکی گلوکۆزدا، تووشبوونی نەخۆشی شەکرە (دایەبیت). | تێکچوونی پێست و تێکچوونی گورچیلەیی. | ڕۆنی گیایی، گۆشت، شەورییەکان. |

## بڕی بەکارهێنانی وزەی ڕۆژانە:

١-بـــڕی بـــەکارهێنانی وزەی لایـــەنی پێویـــستی ڕۆژانـــەی تاکێـــك ٣٠٠٠-٢٥٠٠ کیلۆکالۆری بۆ پیاوان و ٢٥٠٠-٢٠٠٠ کیلۆکالۆری بۆ ژنانە.

٢-لە چالاکییەکانی وەرزشی پەیوەسـت بـە جـۆر و ئاسـتی چـالاکی، کـالۆری لایـەنی پێویست جیاوازی دەکات.

٣-لـەکاتی پـشودا، بـڕی بـەکارهێنان ١ کیلـۆ کالۆرییـە لـە خولەکێکـدا، کـە بـۆ زیندەچالاکی و هەناسەدان و جوڵەکانی دڵ و.... لایەنی پێویستیە.

٤-لە چالاکییە سوکەکانی ڕۆژانە ٥ کیلـۆ کـالۆری لـە خولەکێکـدا بـەکاردێت. ئـەم چالاکییانە ڕێ ڕۆیشتن و یاری گۆڵف دەگرنەوە.

٥-لە چالاکییە مامناوەندەکان، ٧ کیلۆکالۆری لە خولەکێکدا وەکـو پاسکیلـسواری و مەلەکردن بەکاردێت.

٦-لە چالاکییە تونـدەکان، ١٠ تـا ١٢ کیلۆکـالۆری لـە چـالاکییە قورسـەکانی وەك: زۆران، تێنس، سکالێری، لەشجوانی بەکاردێت.

٧-بەرنامەیەکی داواکراوی خۆراکی ٦٥-٥٥ لە سـەدی کاربۆهیـدرات، ٣٠-٢٥ لـە سەدی پرۆتین، ٣٠-٢٠ لە سەدی چەوری پێویستە.

تێبینیەکان لە میوەکان و سەوزەکان و خواردن و دەرمان.

١-لۆبیا و قەڵەوی: خواردنی لۆبیا بە بڕێکی زۆر هۆی قەڵەوی و غازات دەبێت.

٢-ئاوی لیمۆ: لـە قـاپێکی جـێ سـەهۆڵی شەشـپاڵویی بکـەن و هـەر جـارەی ١ تـا ٢ کەوچکی چێشتخۆری لە ئاو لیمۆ لە مایکرۆفێر دا گەرم بکەن، یان بیکەنە ١ پەرداخ ئاوی ساردەوە و تا تازە بێت و ئاوی لیمۆکە بە بڕی پێویست بکەنە خواردنەوە.

٣-کشمیش و چارەسەری قەبزی: هەر ڕۆژەی بەکارهێنانی ٦ تا ٨ دانە کشمیش کە لـە ئاوی گەرمدا بخویـسێنرێت و پـاش لـە ساردکردنەوەی بخورێتـەوە، هـۆی لابردنـی قـەبزی بەتایبەت لە منداڵاندا دەبێت.

٤-دارچینی و غازاتی سك: تا ڕادەی چەند گرەمێك دارچینی لە ١ فنجان ئاوی گەرمـدا بتوێتەوە و پاش لە ١٥ خولەك، ئاوەکە بخۆنەوە/ غازاتی سك چارەسەر دەکات.

٥-نیسك و لاوازی: خواردنی نیسکی زیاد لاوازی لەگەڵە، هەرچەندە بڕی داواکراوی نیسك زۆر بەسودە.

٦-لیمۆ و نەعنا: بۆ لابردنی تەمەڵی و خەواڵویی بەیانیان و هاندانی چالاکبوون، ١ کەوچکی چایخۆری ئاوی لیمۆی تازە و نەعنا لەگەڵ ١ کەوچکی سوپخۆری هەنگوین تێکەڵ بکرێت و بخورێتەوە.

٧-بستە: کاکڵەی بستە هۆی بەهێزکردنی هێزی مێشك دەبێت.

٨-خواردنی لیمۆترش: هۆی بێهێزی دەمار و نەتوانینی سێکسی دەبێت.

٩-ڤیتامین بی٢: کەمبوونی ئەم ڤیتامینە هۆی ترەکینی لێو دەبێت، لە بەشە سەوزەکان گیاکان وەکو کاهو بە زۆری هەیە.

١٠-ئاوی پرتەقاڵ: هۆی بەهێزکردنی گشتی لەش دەبێت.

١١-ئاوی هەنار: هۆی چاکبونە و ڕێڕەوی میزی ئەو کەسە بە پاکی ڕادەگرێت.

١٢-ئاوە تەماتە: هۆی دابینکردنی ڤیتامین سی و ئەی و بی و مەوادە کانزاییەکان و بەهێزکردنی دەمار دەبێت.

١٣-گێزەر: ئاوی گێزەر هۆی چارەسەری کەمخوێنی، برینی گەدە و چارەسەری تێکچونەکانی پێستی دەبێت.

١٤-نەعنا: هۆی بۆنخۆشی، تێرئاوە و چارەسەری نزگەرە دەکات.

١٥-چای دارچینیدار: یەك فنجان ئاوی کوڵاو نیو کەوچکی چایخۆری دارچینی، زەنجەبیل و مێخەکی بۆ زیاد بکەن و پاش لە پاڵاوتن، لەگەڵ هەنگوین بیخۆنەوە تا کۆکە بەڵغەم هێنەرەکان چارەسەر بکات.

١٦-ڕۆنی مێخەك: لە گرژبونی ماسولکەکانی لەشدا، بە ڕۆنی مێخەك ڕووی شوێنە گرژبووەکە بماڵن.

١٧-بۆنخۆشکردنی خواردن و پرتەقاڵ: پێستی پێکهاتەکانی پرتەقاڵەکە وشك بکەنەوە و بەشێوەی پاودەر دروستی بکەن و پاشان لە چێشتخانەدا بەکاربێنن.

١٨-هەنگوین: بەکارهێنانی یەك کەوچکی چایخۆری هەنگوین لە نیو پەرداخ ئاوی گەرمدا لەگەڵ ئاوی یەك دانە لیمۆ، هۆی لابردنی قەبزی دەبێت.

١٩-ئاوی گویزی هیندی و ترشبوونی گەدە: تکە ئاوەکانی شوتی و خەیار لەم بوارەدا بەسودن و ڕۆژانە ٣ پەرداخ ئاوی گویزی هیندیش ئەم کێشەیە کەم دەکاتەوە.

٢٠-یۆد: بۆ بەهێزکردنی چالاکی گورچیلەکان بەسودە، هۆی بەهێزکردنی هێزی مێشك دەبێت. ئەم مادە بەسودە کانزاییە لە بەرهەمەکانی دەریایی و کەلەرم و سپێناخ و تووەفەرهەنگی و ترێ و گێزەر بە زۆری هەیە.

٢١-گۆگرد: لە کۆمەڵەی مەوادە کانزاییە بەسودەکانە کە لە سەلامەتی پێست ڕۆڵی گرنگی هەیە و لە سەلامەتی پێستدا ڕۆڵێکی گرنگی هەیە و بە زۆری لە: سی و پیاز و زەرات و برنج و کەلەرم و بستە و پرتەقاڵ و قەیسی و لۆبیای سەوزدا هەیە.

٢٢-هەنگوین: دژە ژەهرە و بۆ ئازار، زۆربەی ئازارە موزمینەکان بە بەکارهێنانی بەیانیانی هەنگوین چارەسەر دەبێت.

٢٣-ڤیتامین بی ٥: لە پارێزگاری کردن لە پێست و موو ڕۆڵێکی زۆر گرنگی هەیە و لە چەکەرەی گەنم دا بە زۆری هەیە.

٢٤-ئاووترێ: خواردنەوەی چەند پەرداخێك ئاو لە کاتی بەیانیان یان ترێ یان شیرین بەیان بۆ لابردنی قەبزی گونجاوە.

٢٥-زەعفەران: شادی هێنەرەو هۆی بە هێزکردنی گورچیلەکان دەبێت.

٢٦-گێزەر: هۆی بەهێز کردنی توانای بینای و چالاکی دەبێت و لە زوو پیر بوون بەرگری دەکات.

٢٧-کونجی: بەکارهێنانی ڕۆژانەی کونجی لە گەڵ هەنگوین، هۆی بەهێز کردنی حافیزە دەبێت، وە کۆکەی بەردەوام چارەسەر دەکات و دەبێتە هۆی بەهێزکردنی توانای سێکسی.

٢٨-ئاو لیمۆو قەڵەوی: بە یانیان تێکەڵی ئاو لیمۆو هەنگوین بخۆنەوە تا لە قەڵەوی بەرگری بکەن.

٢٩-قەڵەوی و چای سەوز: بۆ کەم بوونەوەی چەوری و بەرگری لە قەڵەوی ڕۆژانە ٣ پەرداخ چایی سەوز بخۆنەوە.

٣٠-نەعناو ئافەتی دەم: ( چایی نەعنا ) بە سوود وەرگرتن لە نەعناو ئاوی کوڵاوو کەمێ خوێ مەعجونەکەی دروست دەکرێت و بیخۆنەوە تا بۆنی دەم چاك دەبێتەوە.

٣١-سپێناخ و لابردنی تەمەڵی و هیلاکی: بەکارهێنانی ڕۆژانە یەك فنجان سپێناخی پوخت هۆی چالاکی دەبێت.

٣٢-لیمۆترش و نزگەرە: هەرچەندە مژینی لیمۆ ترش بە زۆری نزگەرە چارەسەر دەکات بەڵام باس لە مەساج کردنی (ناوچەی قورگ و گەروو ) لەگەڵ یەك پارچە سەهۆڵ و یان مژینی تەواوی پارچە شەکرێکیش بۆ ئەم نەخۆشیە باسی لێوە کراوە.

٣٣-چایی و لابردنی بۆنی پیسی قاچەکان: بۆ حەل کردنی ئەم کێشەیە، ڕۆژانە قاچەکان بۆ ماوەی ١٥ خولەك لە چایی تۆخ دا دابنرێت و تا لە ئەنجامدا بە باشی قاچەکان بۆنیان خۆش دەبێت.

٣٤-چای نەعنا و ئازاری ددان: لەکاتێ کە دەستت بە پزیشك ناگات، خواردنەوەی چای نەعنا هۆی هێورکردنەوەی ئازاری ددان دەبێت.

٣٥-لیمۆ و سپیکردنەوەی ددانەکان: لەگەڵ پاودەری پێستی لیمۆ، برێك خوێی بۆ زیاد بکە و بە ددانەکاندا بیماڵە، ڕەنگی ددان سپی و بریقەدار دەکات.

٣٦-سێو و سکچون: ١ دانە سێو پاش لە لێکردنەوەی پێستەکەی، بدرێت لە ڕنە و پاش لە چارەکێك (کاتێك ڕەنگەکەی دەبێتە قاوەیی) بخورێتەوە.

٣٧-ڕەیحانە و زیپکەی دەم و چاو (ئەکنی) لاوان: ٣ کەوچك ڕەیحانەی وشك زیاد دەکرێت بۆ ١ فنجان ئاوی کوڵاو پاش لە ساردکردنەوەی بە لۆکە یان گوێ پاککەرەوە ڕووی زیپکەکانی پێ بماڵن تا بە خێرایی چابێتەوە.

**تێبینی: پاقلەی تەڕ،** لەوانەیە ببێتەهۆی دەرکەوتنی کاریگەری یەك کە فابیسم ی پێ دەڵێن توندی کاریگەرییەکانی بە ڕادەیەکە کە لەوانەیە هەندێ جار هۆی مردن فەراهەم بێنێت، کاریگەری بەکارهێنانی پاقلەی تازە بریتی یە لە: کەمخوێنی، تێکچونی ڕۆحییەکان، ورێنە، نارەحەتیەکانی دڵ هەتا مردن بەتایبەت لە منداڵاندا ڕوودەدات.

## هەندێ لە ڕووەكەكان و سودەكانیان

١-مێخەك: بۆ زیادكردنی ئیشتیها و دژەهەوكردن و ئازاری ددان لەكاتی خورانی ددانەكان و برینە هەوكردوەكان و سیلی پێست و پەڵە سپی یەكان لە كۆرنیەی چاو و بەهێزكردنی دەمار بەكاردێت.

٢-ئابوسن:بۆ چارەسەری كرم و ئەمیبای ڕیخۆڵە بەكاردێ.

٣-ئادۆنیس: بۆ بەهێزكردنی لەش و پەركەم كەم كردنەدەرەوەی میز بەكاردێت.

٤-سپێناخ: بۆ كەمخوێنی و كردنەدەرەوەی مەوادە زیادەكانی ڕیخۆڵە و بۆ بەهێزكردنی بەرگری و زیادبونی دەردراوەكانی گەدە و ڕیخۆڵە و پەنكریاس و زیادبوونی دەردراوەكانی زراو بەهێزكردنی جوڵەكانی دودی ڕیخۆڵە و كەمبونی ڤیتامینەكانی ئەی و بی و سی و دی و بۆ نەخۆشی یەكانی پێست و لە نەخۆشیە تیژەكان بە عینوانی خۆراكی بەسود و نەخۆشی ئەسكەربوت و بۆ بەهێزكردنی دەمار و بۆ چارەسەری كۆكە وشكەكان و ڕەبۆ و گیرانی دەنگ و  بۆ چارەسەری قەبزی و كۆڵنجەكانی جگەر و رۆماتیزم و نەخۆشی پاشاكان و كەم دەردانی شیری دایك بەكاردێت.

٥-پاقلە: بۆ تەشەنوج و بەردی گورچیلە و كۆڵنجی گورچیلە و ئیلتیهاب و ئاوسانی میزەڵدان و رۆماتیزم و نەخۆشی پاشاكان و ئیلتیهابەكانی لەش و دومەڵ و زیپكەكانی پێستی بەكاردێت.

٦-پیاز: بۆ زیادكردنی تۆ و رۆماتیزم و نەخۆشیەكانی جگەری و ئیلتیهابی و بەردی گورچیلە و بۆ وەرەمی ماسولكەی دڵ و شێرپەنجەی جگەر بەكاردێت.

٧-گوێزی سپی: ئیشتیها هێنەرە بۆ تا و زیادكردنی میز و بۆ یارمەتی هەرس و بۆ فیێ و ڕەبۆ و لاوازی دەمار و تەشەنوج بەكاردێت.

٨-دارچینی: بۆ سكچون و بەهێزكردنی دەزگای هەرس و بەهێزكردنی كۆئەندامی سوڕی خوێن و خراپی هەرس و لاوازی گشتی لەش و وەستانەوەی خوێن و خوێنبەربوون لە ماوەكانی بێ نوێژی بەكاردێت.

٩-نەعنا: بۆ بەهێزكردنی گەدە و بۆ تەشەنوج و بۆ دژەهەوكردن و دڵەپێچە و سكچونە سادەكان و ئازارەكانی دەماری و كزانەوەی گەدە و ئازاری مەوزوعی و روكاری و شەقیقە

و سیاتیك و ئازاری ددان و نەخۆشی یەكانی پێستی سەر و ڕشانەوەی ژنانی سكپڕ و كۆكـە و ئازاری گەدە و لینجی گەدە بەكاردێت.

١٠-هێل: بۆ بەهێزكردنی گەدە و بەهێزكردنی تەواوی لەش بەكاردێت.

١١-گێزەر:بۆ زیادكردنی میز و كۆڵنجەكانی گورچیلەیی و بەهێزكردنی گەدە و غازات و ژەهراویبوون و بۆ كردنەوەی ڕێڕەوی خوێنبەرەكانی دڵ و بۆ ئازاری سنگ و سـنگەكوژێ و بۆ بێ مەیلی سێكسی و بـۆ كـەمخوێنی كـاتی بلـوغ و نەخۆشـیەكانی هـەوكردن و كـەم كردنەدەرەوەی میز و هاندان و ئیلتیهابی ڕێڕەوی هەرس و هەناسە و بۆ كۆكە بەردەوامەكان و ڕەبۆ و كرمی ریخۆڵە بەكاردێت.

١٢-یۆنجە:بۆ تێكچونەكانی ئێسكی و خـۆراكی منـداڵ و یارمەتیـدان بـە گەشـەی مـرۆڤ بەكاردێت.

١٣-مۆرد:بۆ دژەهەوكردن ومشەخۆری ریخۆڵـە و بـەهێزكردنی گـەدە و نەخۆشـیەكانی كۆئەندامی هەناسەدان و میزەڕۆ و ڕەبۆ و لاوازی فرمانی كۆئەنـدامی هـەرس و سكـچون و تەرەشوحاتی مەبلی و خوێنبەربونەكان و نەخۆشی یـەكانی پێـستی و ڕوشـانی لینجەپـەردەی دەم.

١٤-ڕازیانە: بۆ زیادكردنی میز و كردنەدەرەوەی یوریا و یوریك ئەسید و بۆ چارەسـەری كەم ئیشتیهایی و قەتعی حاڵەتی بێ نوێژی و بۆ بەردی گورچیلە و ئیلتیهابی گورچیلە و بـۆ بەهێزكردنی گەدە و زیادكردنی دەردانی شیر و ئازاری گەروو و گیرانـی دەنـگ و ئاوسـانی بەشتی ناوەوەی پێڵوی چاو بەكاردێت.

١٥-ڕەیحانە: بۆ چارەسەری تەشەنوج و بۆ زیادكردنی میز و بـۆ چارەسـەری شـەقیقە و سەرئێشەكانی دەماری و بەهێزكردنی دەزگای هەرس و غازات و سەرگێژبوون و دڵەپێچە و كۆكە و ئازاری سنگ و كۆكەڕەشە و بۆ زیادكردنی شیری دایك و بۆ ئاوسانی گورچـیلە و بۆ دەردراوەكانی مەبلی و ئیلتیهابی میزەڕۆ بەكاردێت.

١٦-زرشك: بۆ پالاوتنی خوێن و بۆدژەهـەوكردن و بـۆ زیـادكردنی میـز و بـۆ نـارێكی كارەكانی دەزگای هەرس و بەدهەرسیە موزمینەكان و كەم ئیـشتیهایی و قـەبزی و كـۆڵنجی جگەری و گورچیلەیی و زەردی و تای صەفراوی و نەخۆشـی پاشـاكان و رۆمـاتیزم و تـای

هەوکردن و گرانەتاو ئازاری سنگ و خوێنبەربوونی نائاسایی ژنان و سکچونی موزمین و نەخۆشی ئەسکەرپوت بەکاردێت.

١٧-زەعفەران: یارمەتیدانی هەرس و هێورکەرەوەی دەمارە روکاریەکانی لەش و بێ نوێژی و کۆکە و ئازاری ددان و هەوکردنی موزمینی بۆرێچکەکان و بێخەوی بەهۆی هاندانەکانی مێشکی و تەشەنوج بەکاردێت.

١٨-زەنجەبیل: بۆ بەهێزکردنی لەش و بەهێزکردنی گەدە و بۆ بەهێزکردنی سێکسی و بۆ چارەسەری نەخۆشی ئەسکەرپوت بەکاردێت.

١٩-زەیتون: بۆ تا و قەبزی و صەفراو و بەردی صەفراو و کۆلنج و کۆکە و داخرانی ریخۆڵە و زیادکردنی میز و بۆ کەمکردنەوەی پەستانی خوێن و بۆ کردنەوەی ڕێڕەوی دەماری رووکاری و نەخۆشی شەکرە و کردنەدەرەوەی یوریا بەکاردێت.

٢٠-زیرە: بۆ بەهێزکردنی لەش و یارمەتی هەرسکردنی خۆراك دەدات و بۆ زیادکردنی میز و بۆ بێ نوێژی و کرمی گەدە و تەشەنوج و بۆ زیادکردنی دەردانی شیر و بۆ لاوازی کاری دەزگای هەرس و غازات و دڵەپێچەی منالان و دواکەوتنی حالەتی بێ نوێژی ئافرەتانی لاو و بێ نوێژی ئازاردار و لاوازی دەمار بەکاردێت.

٢١-زیرەی سەوز: بۆ تەشەنوج و پەرکەم و بەهێزکردنی گەدە و زیادکردنی میز و قەتعی حالەتی بێ نوێژی لە ئافرەتانی لاو و تەرەشوحاتی مهبلی و غازاتی ریخۆڵە و خراپی هەرس و غازات و کۆبونەوەی شیر لە مەمکدا بەکاردێت.

٢٢-سماق: بۆ سکچون و وەستانەوەی خوێنبەربوون و خوێنبەربونی گەدە و ریخۆڵە و سیل بەکاردێت.

٢٣-سیر: بۆ دژەهەوکردن و یارمەتی بۆ هەرسکردنی خۆراك و بێ ئیشتیهایی و بۆ صەفراو کرمی ریخۆڵە و بۆ دابەزاندنی زەخت و چەوری و شەکری خوێن و بۆ کرمی ریخۆڵە و ئیلتیهاب و برینەکان و نەخۆشی یەکانی سی و نەخۆشی هەرس و بۆ رەقبونی خوێنبەر و بۆ رێکخستنی لێدانی دڵ و بۆ ژەهراوی بوون بە نیکۆتین و تێکچونەکانی دڵ و برینی هەکردوو و ئازاری دەمار و رۆماتیزم و ئارتریسم بەکاردێت.

٢٤-شێلم: بۆ قەبزی و کۆڵنجی جگەری و گورچیلەیی و چاکردنەوەی برینەکان و بـۆ زیادکردنی میز و بەردی گورچیلە و نەخۆشی پاشاکان و نەخۆشی ئەسکەرپوت و ئیلتیهـابی میزەڵدان و قەڵەوی بەکاردێت.

٢٥-شوید: بۆ بەهێزکردنی گەدە و یارمەتیدانی هەرس و زیادکردنی میز و بۆ تەشەنوج و ڕشانەوە و زیادکردنی دەردراوەکان و بۆ ئازاری گەدە و دڵەپێچەی منـاڵان و نزگـەرەو بـۆ چارەسەری کەمبونەوەی شیری دایك و بێخەوی و کەم کردنەدەرەوەی میز بەکاردێت.

٢٦-عەرعەر: بۆ کرمی کەدو و سکچونە سادەکان بەکاردێت.

٢٧-بیبەری سەوز: بۆ هاندانی ئیشتیها و بۆ بەهێزکردنی گـەدە و زیـادکردنی میـز و بـۆ چارەسەری کەمی کـاری کۆئەنـدامی هـەرس و تـۆ ترشـکردنی خـواردن و بـۆ ڕشـانەوەی بەردەوام و سکچون و مایەسیری و شەقیقە و ڕۆماتیزم و کۆکـە ڕەشـە و گیرانـی دەنـگ و کۆکەی دوبارە و ئازاری سنگ و زات الریە و نەخۆشی پاشـاکان و ئازارەکـانی دەمـاری و ئازاری کەمەر و ئیفلیجیە مەوزوعیەکان و بۆ بەرگری لە هەڵوەرینی موو بەکاردێت.

٢٨-کەرەوز: بۆ زیادکردنی میز و بۆ بەهێکردنی گـەدە و بـۆ نەخۆشـی ئەسـکەرپوت و صەفراو و نەخۆشی پاشاکان و ڕۆمـاتیزم و یوریـك ئەسـید و زەردی و بـەردی گورچـیلە و کۆکە و ڕەبۆ و لاوازی دەزگای هەس و نەخۆشیەکانی میزەڵدان و قەڵەوی بەکاردێت.

٢٩-کەتان: بۆ چارەسـەری قەبزی و ئیلتیهابی لینجە پەردەکانی لەش بەتایبەتی میـزەڕۆ و بۆ وەرەمی میزەڵدان و ئسلتیهابی ئازاردار بەهۆی بەردی گورچـیلە و کۆکـە و بـێ نویـژی ئازاراوی و ئیلتیهابەکانی ڕوکاری لەش و شـەکری خـوێن برینـە ئازارداره‌کـان و دومـەڵ و نەخۆشی یەکانی پێستی بەتایبەت سەودا و خوران بەکاردێت.

٣٠-شلیك (توە فەرهەنگی): بۆ سکچون و بۆ زیادکردنی میز و بۆ پالاوتنی خوێنی و بـۆ بەهێزکردنی دەمـار و بـۆ خوێنبەربونـەکان و بـەردی گورچـیلە و مایەسـیری و ڕۆمـاتیزم و نەخۆشی پاشاکان و ئازاری سنگ و سـەرمابوونی ئەندامـەکان و کـەم ئیـشتیهایی و لاوازی کاری دەزگای هەرس و نەخۆشیەکانی میزەڕۆ و ئارەقکردنی شەوانە بەکاردێت.

## ئاوی میوە و بەکارهێنانی وەك چارەسەر

### ئاوی کەنگری فەرهەنگی

ئاو یان شیرەی گەڵای ئەم ڕووەکە خوێ کانزایە جیاوازەکانی تیادایە و بەکارهێنانیکی زۆری هەیە، بەکارهێنانی یوریای خوێن و ڕێژەی لە صەدی ناسروشتی کۆلیسترۆڵی خوێن کەم دەکاتەوە.

ئەم ڕووەکە خاسیەتی دەرمانی تریشی هەیە:

١-بۆ بەهێزکردنی توانای سێکسی بەسودە.

٢-ژەهری خوێن دەکاتەدەرەوە.

٣-میزهێنەرەو بەهێزکەرە و دژی صەفرایە.

٤-ئەم ڕووەکە ڤیتامین سی تێدایە بۆ ئەو کەسانەی توشبوون بە سەرمابوون زۆر بەسودە.

٥-بۆ تەصفیەی خوێن و بەرگریکردن لە ڕەقبوونی خوێنبەرەکان بەکاردێت.

٦-بۆ مەبەستی بەهێزکردنی دڵ و حافیزە دەرمانێکی بەسودە.

٧-ئاوی ئەم گیایە لە چارەسەری برینی ڕیخۆڵە و بەدهەرسی و نەخۆشی یەکانی گەدە کاریگەری هەیە.

٨-خواردنەوەی ئاوەکەی بۆ لابردنی کۆلیسترۆڵ و یوریای خوێن و شەکرە و سیل و سکچون و یوریك ئەسید و سەرئێشە و تا و رۆماتیزم و نەخۆشی پاشاکان وبەردی کیسەی زراو و جەڵتەی مێشکی و هیپاتیتی جگەر و قەڵەوی و بەردی میزەڕۆ بەسودە.

### ئاوی سپێناخ

بەهۆی بونی خوێی کانزایی زۆرەوە کلۆرۆفیل و ئاسن لە دابینکردنی توخمە کانزاییەکانی لەش و هەروەها دروستکردنی خوێن و یارمەتی کاریگەری هەیە و لە لابردنی کەمخوێنییەکان ئەتوانێت ئەنجامی چارەسەری موسبەتی هەبێت، بۆ لابردنی هیلاکی جەستەیی و رۆحی بەسودە.

خاسیەتی دەرمانی:

١-بۆزیادکردنی شیری دایك و لابردنی بەردی زراو بەسودە.

٢-لە لابردنی کۆلیسترۆڵی خوێن و ڕەقبوونی خوێنبەرەکان کاریگەری هەیە.

٣-بۆ بەهێزکردنی گشتی لەش و سی و بۆ بەهێزکردنی پەنکریاس و جگەر بەسودە.

٤-میزهێنەرە و نەرمکەرەوەیە و لابەری بەڵغەمە و دژی صەفرایە.

٥-بۆ پەستانی خوێن و کەمخوێنی بەکاردێت.

٦-ئاوی ئەم رووەکە تفتە و لە ڕونکردنەوەی خوێندا کاریگەری هەیە.

٧-بۆ بەهێزکردنی دەمار بەکاردێت و هیلاکی لادەبات.

٨-بۆ گەشەکردنی دانەکان و بەهێزبوونی پوك بەسودە.

٩-بەکارهێنانی ئاوەکەی بەرگری لە کەمخوێنی و لاوازی و نەخۆشی شەکرەو تینوێتی و سیل و زەردی و جۆرەکانی نارەحەتی پێستی و خوران پێستی و وەرەمی ڕیخۆڵە و هەوکردنی ڕیخۆڵە و جەڵتەی مێشك و گیرانی دەنگ و برینەکانی ڤاریسی و کزانەوەی میزکردن و وەرەمی زمانە بچکۆلە و ئازای سنگ و مایەسیری و نارەحەتیەکانی میزەڕۆ و گواتر و ئازاری قورگ وەرەمی سی و شێرپەنجەی سورێنچك و سی و ئازاری کەمەر و گرانەتا و لەکەی دەم و چاو و دومەڵ و کۆرك ئەتوانێت تا ڕادەیەك سودمەند بێت.

## ئاوی بلاڵوك

کانزای ئاسن و ڤیتامین سی تێدایە و خاسیەتی تریشی هەیە:

١-بۆ چاکردنەوەی برینەکان و لابردنی صەفرا و دابەزاندنی پلەی گەرمی و نەهێشتنی تینوێتی بەکاردێت.

٢-بۆ بەهێزکردنی تۆنەکانی دەنگی و بەهێزکردنی جگەر بەسودە.

٣-بۆ دابەزاندنی پەستانی خوێن و خەستی خوێن و بۆ بەرگری لە ڕشانەوە و کۆکە و هەروەها بۆ زیادکردنی ئیشتیها بەسودە.

٤-بۆ توشبوان بە کزانەوەی میزەڕۆ و بەردی میزەڵدان و وەرەمی گورچیلە بەسودە.

٥-بۆ لابردنی خورانی پێستی بەسودە.

٦-بۆ بەهێزکردنی توانای سێکسی و دەمار و بینایی بەسودە.

٧-بۆ چارەسەری وەرەمی گەدە و وەرەمی سی و لابردنی بەدهەرسی کاریگەری هەیە.

٨-بۆ کەسانی توشبوو بە نەخۆشی شەکرە و زیپکەکانی دەم و چاو بەسودە.

٩-نەرمکەرەوە و میزهێنەرە و بۆ تەصفیەکردنی خوێن بەسودە.

## ئاوی هەنار

لە نەخۆشی یەکانی میزەڕۆ و ئیلتیهابی کۆئەندامە جیازەکانی لەش و لە نەخۆشەکانی دەرنەدانی بەشی تەواوی زەرداو بەسودە و خاسیەتی دەرمانی تریشی هەیە:

١-بۆ توشبوان بەنەخۆشی شەکرەی خوێن ئاوی هەناری ترش باشترە لە ئاوی هەناری شیرین.

٢-ئیشتیها زیاد دەکات و لە میزپێکەرەکانە.

٣-ئاوی هەناری شیرین دەبێتەهۆی زیادکردنی توانای سێکسی و زیادکردنی تۆو.

٤- ئاوی هەناری شیرین بۆ سەرمابوون بەسودە.

٥-ئاوی هەناری شیرین بۆ لابردنی هیلاکی بەسودە و چالاککەر و شادی هێنەرە.

٦-بۆ ئەو ئافرەتانەی توشی خوێنبەربوونی نائاسایی منداڵدان هاتوون بەکارهێنانی ئاوی هەنار فەرامۆش نەکەن.

٧-بۆ ئەو کەسانەی توشی سکچونی خوێناوی و ڕشانەوە هاتوون کاریگەرە.

٨-هۆی لابردنی خوێنی میز و روونکردنەوەی خوێن دەبێت.

٩-خواردنەوەی ئاوی هەناری ڕەش بۆ کۆکە ڕەشە بەسودە.

١٠-بەکارهێنانی ئاوی هەنار بە بەردەوامی بۆ بەرگری لە سیفلیس و لاوازی و ژەهراویبوون و تینوێتی و خوێنبەربوونی گەدە و زیپکەی دەم و ئازاری گوێ و تا و خورانی کۆم و پێست و ئیلتیهابی گەدە و ڕەبۆ و مەیینی خوێن و خوێنتێزانی جگەر و تاڵی دەم و ترپەی دڵ و تەصفیەی خوێن کاریگەری هەیە.

## ئاوی ئەناناس

ئاوی ئەناناس ڤیتامینە جیاوازەکان و توخمی کانزا بەسودەکانی تێدایە و جۆرێکی مادەی هەرسکەری زۆر بەهێزە.

بۆ لابردنی ناتەواویەکانی هەرسی کاریگەرە و لە ماوەی گەشە و پێگەیشتندا هەروەها لە دابینکردنی هێزی لاشەدا بەسودە و خاسیەتی میزپێکەری هەیە و لابەری ژەهرە و خاسیەتی دەرمانی تریشی هەیە:

١-ئیشتیها هێنەر و میزپێکـەرە و دژی برینـی گـەدە و شـێرپەنجە و دژی نارەحەتیـەکانی جگەرییە.

٢-خوێن تفت دەکات و بە هەرسکردنی پرۆتین کۆمەکی دەکات.

٣-بۆ بەهێزکردنی گەدە و گورچیلـەکان و هەروەها بۆ بەهێزکردنی ئێسك بەسودە.

٤-بۆ بەهێزکردنی هێزو توانای سێکـسی و بـەهێزکردنی جگـەر و لـەنێوبردنی خـورانی پێستی و ڕەقبوونی خوێنبەرەکان و هێورکردنەوەی ئازاری گەروو بەسودە.

## ئاوی هەنجیر

زۆرێك لە ڤیتامینەکان و بەتایبەتی ڤیتـامین بـی١ و هـەروەها خـوێ کانزاییـەکانی وەکـو پۆتاسیۆمی تێدایە.

کۆمەڵێك خاسیەتی دەرمانی هەیە:

١-بۆ کۆلیسترۆڵی خوێنی ڕەقبونی خوێنبەرەکان بەسودە.

٢-سنگ و ریخۆڵە نەرم دەکاتەوە و پلەی گەرمی لـەش کەمدەکاتـەوە و لینجـی خـوێن چارەسـەر دەکـات و خـوێن تفـت دەکـات و هـەروەها لـە منداڵانـدا هـۆی بـەهێزبوون و گەشەکردن دەبێت.

٣-بۆ بەهێزکردنی لەش بەسودە.

٤-بۆ بەهێزکردنی دڵ و جگەر و میزەڵدان و سـی و گورچـیلـەکان بەسـودە و هـەروەها حافیزە بەهێز دەکات.

٥-بۆ میزەچرکە و میزکردنی چەندبارە سودی هەیە.

٦-کۆئەندامی هەرس بەهێز دەکات و تینوێتی لادەبات و زەرداویش لادەبات.

٧-بەکارهێنانی ئاوی هەنجیر لە چارەسەر و بەرگری لە تا و داخرانی جگەر و هـەوکردن و وەرەمی ریخۆڵە و صەرع و تەشـەنوج و ئـازاری کەمـەر و رۆمـاتیزم و یوریـك ئەسـید و سەرمابوون و شێتی و وەسواسی و تەنگەنەفەسـی و مایەسـیری و لـینجـی خـوێن و وەرەمـی گەروو سودی هەیە.

## ئاوی گێزەر

بۆ چارەسەری کەمخوێنییەکان و برینی گەدە و دوانزەگرێ و وەرەمی ریخۆڵە ئەستورە و ریخۆڵەباریکە و سکچونە سادەکان و نەخۆشی یەکانی جگەری و صەفراوی و ژەهراویـیەکان و نارەحەتی یە پێستی یە جیاوازەکان بەکاردێت.

ئاوی گێزەر بە هەبونی توخمەکانی وەك ئاسن و فۆسفۆر و مەگنسیۆم کە لە دروستبونی خوێن و شانەکاندا پێویستن هەروەها ڤیتامینە جیاوازەکان بەتایبەتی پرۆڤیتامین ئەی و مەوادەکانی وەك پێکتینەکان و... لە چارەسەری زۆرێك لە نەخۆشی یەکاندا کاریگەری هەیە. ئاوی گێژەر بۆ هێشتنەوەی گەنجی و درەنگ پیربوون کاریگەری هەیە.

## ئاوی ترێ

بەهێزکەرە و هەر کیلۆیەکی تیکڕای ٨٠٠ بۆ ٩٠٠ کالۆری وزە دروست دەکات.

دژی ژەهرە و بۆ رۆماتیزم و نەخۆشی پاشاکان و بەردی گورچیلە و زیادبونی یوریای خوێن و تێکچونەکان بەهۆی زەخت و وەرەمی ریخۆڵە و خوێنتێزانی جگەری کاریگەری چارەسەری موسبەتی هەیە.بۆ لابردنی هیلاکی گشتی لەش بەسودە.

١-بۆ خوێنبەربونی ناسروشتی منداڵدان بەسودە.

٢-بەڵغەمدەرکەر و میزهێنەر و چالاککەرە.

٣-بۆ تەصفیەکردنی خوێن بەسودە.

٤-بۆ کەمخوێنی بەسودە.

٥-ئەنسۆلینی گیای تێدایە و لەبەرئەوە بۆ شەکرە سودی لێوەردەگیرێت.

٦-بۆ بەهێزکردنی جگەر و دڵ و ئەتوانێت دەردراوەکانی لەش تفت بکات.

٧-بۆ بەرگری لە سەرگێژبوون و ئاوکردنی چاو و خوێنبەربوونی ناوەکی و چرچ ولۆچی دەم و چاو و ژەهراویبون و سیفلیس و سیل و شەقیقە و ئیلتیهابی جومگە و رۆماتیزم و داخرانی رێڕەوی سپڵ و ڕشانەوە لە ژنانی سکپڕ و نەخۆشیەکانی پێستی و قەبزی و پەستانی خوێن و ژەهراویبون کاریگەری هەیە.

## ئاوی پاقلە

بۆ بەهێزکردنی مۆخی ئێسك و هێز و تواناى سێکسی و لابردنی بێخەوی لە کەمخوێنی و برینی ریخۆڵە و سکچون و رشانەوە و بەردی گورچیلە و گیرانی لوت و کۆکە بسودە و ئاوی پاقلە بەڵغەم دەرکەر و زیادکەری شیری دایکە.

## ئاوی شوتی

بەڵغەم دەرکەرە و زیادکەری شیرە و دژی صەفرایە و تەصفیەکەری خوێنە و شادی هێنەرە و لابەری یوریك ئەسیدە و دابەزێنەری زەختە و میزپێکەرە و بۆ خورانی پێستی و ئاوکردنی چاو و بەدهەرسی و کەمخوێنی و بەردی گورچیلە و میزەڵدان و وەرەمی سپڵ و بەڵغەم و نەخۆشی پاشاکان و لاوازی و قەبزی و کەڵەکەبوونی پەرەکانی خوێن و بەردی کیسەی زراو و زەردی و تای هەوکردنی و نەخۆشی شەکرەی خوێن ئەتوانێ کاریگەری سودبەخشی هەبێت. ئاوی شوتی مەوادی ئەنتی بایۆتیك و دژەهەوکەری تێدایە.

## ئاوی پرتەقاڵ

بەهێزکەر و چالاککەرەو خەستی خوێن کەم دەکاتەوە و پارێزەرێکی باشی دەمارە و ڤیتامینەکانی ئەی و بی و سی و پرۆڤیتامین ئەی تێدایە و بەرگری لەش بەهێزدەکات و خاسیەتی دەرمانی هەیە:

١-زەخت کەم دەکاتەوە و دەمار بەهێز دەکات و هیلاکی لادەبات و رێگری ئیحتیلامی شەوانەیە و دژی سەرئێشە و سەکتەی مێشکی و بۆ توشبووانی نەخۆشی شەکرە بەسودە.

٢-بەهێزکەری گەدە و ریخۆڵەیە و هەروەها دەمارەکان بەهێزدەکات.

٣-بۆ چارەسەری وەرەمی ریخۆڵە و هەوکردنی گورچیلە و لابردنی ئەمیبای ریخۆڵە گونجاوە.

٤-بۆ توشبوان بە کۆلیسترۆڵی خوێن و رەقبوونی خوێنبەر و قەڵەوی بەسودە.

٥-بۆ ئەو کەسانەی ئارەق زۆر دەکەن زۆر بەسودە.

٦-لە مایەسیری و جەڵتەی مێشك و خراپبوونی ددان و ئاوی سپی چاو بەرگری دەکات هۆی ترشبونی میز دەبێت.

٧-بۆ ئەوانەی توشی شینبونەوە و رەشی ژێر چاو هاتون بەسودە و پێشنیار کراوە هەر رۆژێك یەك پەرداخ ئاوی پرتەقاڵ بخورێتەوە.

٨-بۆ ئەو کەسانەی لاوازن ئاوی پرتەقاڵ لەگەڵ شیر بەکاربهێنن. بۆ منالی شیرخۆری لاواز ئەتوانیٚ کەمیٚ ئاوی پرتەقاڵ لەگەڵ شیر بەکاربێنێت.

٩-بۆ چارەسەری نەخۆشی یەکانی برینی گەدە و صەرع و یوریك ئەسید و نەخۆشی پاشاکان و سیاتیك و دەردراوە سپی یەکانی منداڵدان و شێرپەنجەی پەنکریاس و شێرپەنجەی سنگ و برینی گەدە و دوانزەگریٚ زۆر بەسودە.

## ئاوی پیاز

میزپێکەرە و بۆ لابردنی ژەهری وەك یوریا و یوریك ئەسید بەسودە و دژەهەوکەری میزەرۆیە و بۆ توشبوان بە رۆماتیزم و نەخۆشی شەکرە و وەرەمی پرۆستات و هیلاکی تەواوی لەش زۆر بەسودە،

١-ئاوی پیاز بەڵغەم دەرکەرەو بەردەدەرکەرە و دژی خەستی خوێنە و بەهێزکەری سێکسیە.

٢-بۆ کۆلیسترۆڵی خوێن و رەقبونی خوێنبەر بەکاردێت.

٣-بۆ خورانی پێستی بەسودە.

٤-تێکەڵی ئاوی پیاز و شیر بۆ بەهێزکردنی جگەر بەسودە.

٥-بۆ بەهێزکردنی تۆنەکانی دەنگی و نەرمکردنەوەی دەنگ بەکاردێت.

٦-بۆ لابردنی ئەمیبای گەدە بەکاردێت.

٧-بۆ جوانکردنی پێست بەسودە بە تێکەڵی لەگەڵ ئاوی هەندیٚ رووەکی تردا.

٨-بۆ توشبوان بە رەبۆ بەسودە.

٩-بۆ بێخەوی بەسودە.

١٠-بۆ گەشەی قەدی ئەندامەکان بەسودە.

١١-بۆ بەهێزکردنی بیستنی بەسودە.

١٢-بۆ لابردنی چرچ و لۆچی پێست بەسودە.

١٣-لە چارەسەر و بەرگری لە نەخۆشی یەکانی وەك بـەردی کیـسەی زراو و وەرەمـی ساقی پێ و سەرمابوون و ڕشانەوە و پرخۆری و ڤاریس و برینەکانی ڤاریسی و ئازاری کەمەر و زیپکە سورەکان و ژەهراویبون و ڕۆماتیزم و قەڵەوی و وەرەمی میزەڵدان و قەبزی گیرانـی دەنگ و وەرەمی پرۆستات و کەڵەکەبوونی پەڕەکانی خوێن بەسودە.

## ئاوی توو

خوێیەکانی وەك ئاسنی تێدایە و خاسیەتی دەرمانی تریشی هەیە:

١-میزپێکەرە و نەرمکەرەوەیە و زیادکەری شیرە و بەهێزکەری سێکسی و وزەیە.

٢-بۆ بەهێزکردنی لەش و حافیزە بەسودە.

٣-بۆ ئەو منالانەی توشی سکچون هاتوون بەکاردێت.

٤-بۆ کەسانی لاواز بەسودە.

٥-بۆ پێشگرتن لە حەساسیەتی لەش و تینوێتی و ئازاری گەروو و مێکوتـە و بەدهەرسـی و برینی ڕیخۆڵە و گەدە و زیادبوونی لیك بەسودە.

٦-جگەر و سیەکان و سپڵ بەهێزدەکات و هەروەها بینایش بەهێز دەکات.

## ئاوی تووە فەرهەنگی

بۆ دابینکردنی توخمە کانزاییەکانی لەش و دژی ڕۆماتیزم و نەخۆشی پاشاکان و بۆ لابردنی یوریك ئەسید و بۆ بەهێزکردنی جگـەر و ڕێکخـستنی کارەکـانی کۆئەنـدامی دەمـار و بـۆ توشبوان بە ڕەقبونی خوێنبەر و بەردی گورچیلە و ژەهراویبون و دژی میکرۆبـە و بەتایبـەت بایلای تایفۆید.

١-تەصفیەکەری خوێنە و تفتکەری خوێنە وتا لادەبات و میزپێکەرە و شیری دایـك زیـاد دەکات و بەهێزکەر و شادی هێنەرە.

٢-گورچیلەکان بەهێز دەکات و هەروەها هۆی بەهێزکردنی هاروەکـان دەبێـت و هـۆی شەفافی و جوانی پێست دەبێت.

٣-بۆ هاندانی ئیشتیها بەکاردێت.

٤-بۆ ئەو کەسانەی توشی کەمخوێنی کۆلیسترۆڵی خراپی خوێن هاتون بەسودە.

٥-هۆی بەهێزکردنی دەمارەکان و لابردنی هیلاکی دەبێت.

٦-لە چارەسەر و بەرگری لە رۆماتیزم و ئازاری گەروو و نەخۆشـی پاشـاكان و یوریـك ئەسـید و تەنگەنەفەسـی و سـیل و كۆكـە و نارەحەتیـەكانی تورەكـەی زراو و شـێرپەنجە و رەقبوونی خوێنبەرەكان بەسودە.

## ئاوی چەوەندەر

دابینكەری توخمە كانزاییەكانی لەش و وزەیە و بۆ كەمخوێنی و كەسانی عصبی و توشـبوان بە نەخۆشی پاشاكان بەسودە و خاسیەتی دەرمانی تری هەیە:

١-دژی قەڵەوی و هێوركەرەوەی سەرئێشەیە و میزپێكـەرەو رەوانكـەرەو بەهێزكـەرە و ئارامبەخش پاڵێوەری خوێنە و بەهێزكەری سێكـسی یـە و ئیـشتیها هێنـەرە و چـاككەرەوەی برینی گەدەیە.

٢-بۆ توشبوان بە زەخت و كەمخوێنی بەسودە.

٣-بۆ لەنێوبردنی كرێشی سەر بەسودە.

٤-بۆ هێوركردنەوەی ئازاری گوێ بەكاردێت.

٥-بۆ تفتكردنی خوێن و هێوركردنەوەی ئازاری ددان بەسودە.

٦-لە چارەسەر و پێشگرتن لە شـێرپەنجە و ئیلتیهـابی جگـەر و سـیاتیك و مایەسـیری و وەرەمی گورچیلە و كۆكە و جەڵتـەی مێـشكی و ئـاوی سـپی چـاو و سكـچونی خـوێنی و نەخۆشی یەكانی پێستی و ئازاری گورچیلە و ئیلتیهابی میزەڵدان بەسودە.

## ئاوی خربزە

ڤیتامین سی و دی تێدایە و خاسیەتی دەرمانیشی هەیە:

١-میزپێكەرەو نەرمكەرەوەیە و عەرەق هێنەرە و زیادكەری شیرە.

٢-میز تفت دەكات و گورچیلە بـەهێز دەكـات و بـۆ بـەهێزكردنی توانـای سێكـسی و هاندانی ئیشتیها بەكاردێت.

٣-بۆ لابردنی هیلاكی و پێشگرتن لە بەردی گورچیلە و نەخۆشـی پاشـاكان و جەڵتـەی دڵ و بەردی میزەڵـدان و كزانـەوەی میـز و زەردی و كـەمخوێنی و بەدهەرسـی و شـێرپەنجە كاریگەری هەیە.

## ئاوی خەیار

توێنەرەوەیە و بۆ لابردنی یوریك ئەسید و پاڵێوەری خوێنە و دژی ژەهرە و لەگەڵ ئاوی ڕووەکەکانی تردا بۆ پێست بەکاردێت و خاسیەتی دەرمانی تریشی هەیە:

١-دژی خورانی پێستە و بەهێزکەری دڵ و گورچیلەکانەو میزپێکەر و نەرمکەرەوەیە.

٢-بۆ لەنێوبردنی زیپکە سورەکانی پێستی بەکاردێت.

٣-بۆ لابردنی وەرەمی پرۆستات بەکاردێت.

٤-بۆتفتکردنی میز بەکاردێت.

٥-بۆ مایەسیری و تینوێتی بەکاردێت.

٦-بۆ لابردنی صەفرا بەسودە.

٧-بۆ ئەو کەسانەی توشی نەخۆشی شەکرەو زەخت و نەخۆشی یەکانی پێستی بوون بەسودە.

٨-بۆ چارەسەر و پێشگرتن لە پوکانەوەی ئێسك و ئیلتیهابی ڕیخۆڵە و نەخۆشی پاشاکان و یوریك ئەسید و ئاوی سپی چاو و چەوری خوێن و زیپکەی دەم و چاو و ڤاریس و قەبزی و کەمخوێنی و سیل و هیلاکی و ئازاری گەروو و لاوازی دەمار و وەرەمی سپڵ بەسودە.

## ئاوی ڕازیانە

بەهێزکەرەو دژی ڕۆماتیزمە و میزپێکەرە و دژی کرم و زیادکەری دەردانی میزە و خاسیەتی دەرمانی تریشی هەیە:

١-بۆ لابردنی صەفرا و بەڵغەم و ئیشتیها هێنەرەو زیادکەری شیرە و دژی کزانەوەی میز و هاندەرە و بەهێزکەرە و تالابەرە و بەهێزکەری جگەر و بیناییە.

٢-خاسیەتی ئەنتی بایۆتیکی هەیە و لەبەرئەوە بۆ نارەحەتیەکانی هەوکردن بەکاردێت.

٣-بۆ پێشگرتن و چارەسەری نەخۆشی یەکانی وەك شێرپەنجە و ڕەقبونی ڕژێنەکانی شیری مەمك و فتق و کۆکە و ڕەبۆ و شەوکوێری و قەڵەوی و کزانەوەی میز و میزەچرکە و بە نارەحەتی میزکردن و ڕێکخستنی بێ نوێژی و غازات نزگەرە لێدان و نارەحەتیەکانی سپڵ بەسودە.

## ئاوی ڕەیحانە

١-زیادکەری شیرە و ئارامبەخشە و دژی غازات و خەوهێنەرە.

٢-بۆ پێشگرتن لە جەڵتەی دڵ بەسودە.

٣-بۆ بەهێزکردنی دڵ و ڕیخۆڵە و بۆ بەهێزکردنی گورچیلەکان و بەهێزکردنی جگەر بەسودە.

٤-بۆ پێشگرتن و چارەسەری بەدهەرسی و تەشەنوجی گەدە و سەرمابوون و هەوکردنی ڕیخۆڵە و کەمخوێنی و ڕەقبونی خوێنبەرەکان و بێهۆشی و وەرەمی گورچیلە و زەختی خوێن و نەتوانینی سێکسی و شەقیقە و سوربونەوەی چاو و صەرع و کۆلیسترۆڵ بەکاردێت.

## ئاوی پەتاتە

بۆ چارەسەری برینی گەدە و دوانزەگرێ و لابردنی یوریك ئەسید و ڕشانەوە و بەدهەرسی و ئازاری دڵ و زەخت و ئەکزیما و سکچونی خوێنی بەکاردێت.

## ئاوی سیر

بۆ کەڵەکەبوونی پەڕەکانی خوێن و گواتر و فەرامۆشی و شەکرە و تای مۆزمین و بێخەوی و لاوازی دەمار و سەرمابوون و ئازاری گەروو و هەوکردنی میزەڕۆ و میزەچرکە و زەخت بەکاردێت.

## ئاوی قەیسی

ڤیتامینەکان و خوێ کانزاییەکان و لە هیلاکی و جەستەیی و رۆحی و کەمخوێنی کاریگەری هەیە. وزەبەخش و چاککەرەو خاسیەتی دەرمانی تریشی هەیە:

١-دژی ڕشانەوە و بەڵغەم دەرکەرەو لابەری صەفرایە و تفتکەری خوێنە و پاڵێوەری خوێنە.

٢-بۆ بەهێزکردنی دەمار و لابردنی هیلاکی بەسودە.

٣-بۆ بەهێزکردنی گەدە و بەهێزکردنی نوتفە بەسودە.

٤-بۆ توشبوان بە زەخت و یوریا بەسودە.

٥-بۆ چارەسەر و پێشگرتن لە جەڵتەی مێشکی و دەردراوەکانی صەفراوی و زەردی و سکچونی قرکێنە لێدانی ترش و شێرپەنجەی پرۆستات و زەردی و وەرەمی قاچ و شێرپەنجەی سی و مایەسیری و قەبزی و لاوازی و شێرپەنجەی پەنکریاس بەکاردێت.

## ئاوی زرشك

١-لابەری تا و صەفرایە و هێورکەرەوەی تینوێتی یە و لابەری بەردی کیسەی زراوە و پاڵێوەری خوێنە.

٢-بۆ چارەسەری وەرەمی پرۆستات بەکاردێت.

٣-بۆ چارەسەری چەوری خوێن و شەکری خوێن و تێکچونەکانی سوڕی خوێن بەکاردێت.

٤-بۆ لابردنی نارەحەتیەکانی منداڵدان بەکاردێت.

٥-بۆ بەهێزکردنی دڵ و گەدە و سپڵ بەسودە.

٦-بۆ نەخۆشی زەخت و ڕەقبونی خوێنبەرەکان بەسودە.

٧-بۆ چارەسەر و پێشگرتن لە تەنگەنەفەسی و رۆماتیز م سیاتیك و وشکی گەدە و مایەسیری خوێناوی و مایەسیری و بەردی گورچیلە و وەرەمی سپڵ و ڕشانەوە و وەرەمی ریخۆڵە و رۆماتیزم و خوێنتێزانی جگەر و زەردی و یوریك ئەسید و خورانی پێستی و ئازاری گەروو بەکاردێت.

## ئاوی سماق

خوێن تفت دەکات و سکچون چارەسەر دەکات و ڤیتامین سی تێدایە و لە تەصفیەی خوێن و کەمکردنەوەی کۆلیسترۆڵی خوێن و پێشگرتن لە جەڵتەی دڵی و مێشکی بەکاردێت.

## ئاوی سێو

بەهێزکەری دەمار و ماسولکەیە و میزپێکەرە و لابەری مەوادی ژەهری لەشە و بۆ توشبوان بە رۆماتیزم و نەخۆشی پاشاکان بەسودە و دژەهەوکەری ریخۆڵە و پالێوەری خوێنە و لە نەخۆشی یە جیاوازەکان بە ناونیشانی یەك خواردنەوەی شادی هێنەر و سودبەخش

بەكاردێت نەرمكەرەوە و ڕەنكەرەو بۆ قەبزی و لابەری قەبزییە و خاسیەتی دەرمـانی تریـشی هەیە:

١-بەهێزكـەری ماسـولكەكان و پـالێوەری خوێنـە و دابەزێنـەری زەخـت و چـەوری و شەكری خوێنە و ئارامبـەخش و شـادی هێنـەرە و میزپێكـەرە و بەردلابـەرە و خەوهێنـەرەو بەلغەم دەركەرە.

٢-بۆ بەهێزكردنی دڵ و هاروەكان و جگەر و گورچیلە و میزەڵـدان و توانـای سێكـسی بەسودە.

٣-بۆ ئەوانەی تامی دەمیان تاڵە و بۆنی دەمیان ناخۆشە بەسودە.

٤-لە سەرمابوون بەرگری دەكات.

٥-بۆ نەرمبونەوەوە و جوانبونی پێست بەسودە.

٦-بۆ كەڵەكەبوونی پەڕەكانی خوێن بەسودە.

٧-بۆ چارەسەری زەردی بەكاردێت.

٨-ڤیتامینی بی و سی تێدایە و هەروەها خاسـیەتی ئـەنتی بـایۆتیكی هەیـە لەبەرئـەوە لـە چارەسەری نەخۆشی یەكانی هەوكردندا بەسودە.

٩-بۆ چارەسەر و پێشگرتن لە نەخۆشی پاشاكان و ئەكزیما و قـەبزی و برینـی ریخۆڵـە و ژەهراویبوون و بوونی یوریا لـە خوێنـدا و شـێرپەنجە و وەرەمـی گورچـیلە و بەدهەرسـی و بێخەوی و ئیلتیهابی جومگە و پوكانەوەی ئێـسك و نەخۆشـی پاشـاكان و یوریـك ئەسـید و گواتر و ژەهـری لـەش و تامێـسك و برینـەكانی ڤاریـسی و ئـازاری جومگـە و رۆمـاتیزم و مایەسیری و نارەحەتیەكانی كیسەی زراو و نارەحەتیـەكانی گشتی لەش بەكاردێت.

## ئاوی شاتوو

بۆ لابردنی ئازاری سنگ و ئافەت و ئیلتیهابی لینجە پەردەی دەم و لابەری صەفرایە و لە چارەسەر و پێشگرتن لە وەرەمی گەروو و قورِگ و وەرەمی دەم و بـەردی كیـسەی زراو و وەرەمی ریخۆڵە و ڤـاریس و زەردی و تینـوێتی و ئـازاری كەمـەر و سـكـچونی خـوێنی و بـۆ لابردنی صەفراو و شۆردنەوەی جگەر بەكاردێت.

## ئاوی شێلم

ئاسن و توخمەکان و پێکهاتە بەسوودەکان و ڤیتامینە جیاوازەکانی تێدایە و کاریگەری سودبەخش و شیفابەخشی لە نارەحەتیەکانی بۆریچکەکانی هەواو ڕێڕەوی صەفراو و لەو نەخۆشیانەی بەهۆی کەمبونی توخمە کانزاییەکانی لەشەوە و میزپێکەرەو بەهێزکەری دەمارە.

ئاوی شێلم خاسیەتی دەرمانی تریشی هەیە:

١-میزپێکەرەو بەڵغەم دەرکەرە و هاندەری ئیشتیهایە و بەهێزکەری بینایە و بەهێزکەری حافیزە و گورچیلەکانە و بەهێزکەری سێکسی یە.

٢-بۆ زەخت و شەکرەی خوێن بەسودە.

٣-بۆ ڕێگرتن لە قەڵەوی بەسودە.

٤-بۆ نەخۆشیەکانی پێستی و بەتایبەت دەم و چاو بەکاردێت.

٥-بۆ توشبوان بە کەمخوێنی و ئەو کەسانەی کەڵەکەبوونی پەرەکانی خوێنیان هەیە بەسودە.

٦-بۆ دابینکردنی خوێ کانزاییەکان و ڕێگرتن لە سپی بوونی موو بەکاردێت.

٧-بۆ چارەسەر و پێشگرتن لە وەرەمی ڕیخۆڵە و ئازاری گەروو و شێرپەنجەی سنگ و دومەڵ و قەبزی و ڕەبۆ و گواتر و تەشەنوج و موەخۆرە و گولی و سیل و سەرمابوون و نارەحەتیەکانی ڕێڕەوی هەناسە کاریگەری هەیە.

## ئاوی کاڵەك

ڤیتامین سی تێدایە و شیری دایك زیاد دەکات و بۆ قەرەبوکردنەوەی کەمخوێنی ئافرەتان بەسودە و میزپێکەر و نەرمکەرەوەیە.

لە ڕەقبونی خوێنبەرەکان و کەڵەکەبوونی پەرەی خوێن و جەڵتەی دڵی بەرگری دەکات و بۆ ئەو کەسانەی توشی کۆلیسترۆڵ و زەخت و مایەسیری و ڕۆماتیزم و یوریك ئەسید و ڤاریس و نەخۆشی پاشاکان بەکاردێت.

بۆ بەهێزکردنی دڵ و دەمارەکان بەکاردێت.

## ئاوی كاهو

زۆرێك لە مادە كانزاییەكان و ڤیتامینەكانی ئەی و بی و سی و دی تێدایە. توخمە بەسودەكانی وەكو ئاسن و كاسیۆم و فۆسفۆر و مەنگەنیز و زینك و مس و صۆدیۆم و كلۆر و پۆتاسیۆم و كۆبالت و ئارسنیك و فۆسفاتەكان و سەلفاتەكان و نیسترۆل و كارۆتینیشی تێدایە.

كاریگەری هێوركەرەوە و دژی تەشەنوجی هەیە و بۆ كەسانی عەصبی و كەمخەو زۆر بەسودە و خاسیەتی دەرمانی تریشی هەیە:

١-تفتكەری خوێن و پاڵێوەری خوێن و زیادكەری شیر و نەرمكەرەوە و میزپێكەر و تا لابەر و لابەری صەفرا و بەڵغەم دەركەر و لابەری بەردی كیسەی زراو و دژی ڕەقبونی خوێنبەرەكان و ئیشتیهاهێنەر وزیادكەری خرۆكە سورەكانی خوێنە.

٢-بۆ بەهێزكردنی ریخۆڵە و گەدە و بۆ بەهێزكردنی كیسەی زراو و بۆ بەهێزكردنی جگەر و مێشك بەسودە.

٣-بۆ لابردنی شەكری خوێن و چارەسەری تێكچونەكانی سوڕی خوێن و ڤاریكۆسیل بەكاردێت.

٤-بۆ چەوری خوێن و پەستانی خوێن بەسودە.

٥-بۆ دابینكردنی خوێ كانزاییەكان و قەرەبوكەرەوەی كەمخوێنی بەسودە.

٦-بەهۆی بوونی مادە كانزاییەكان وەك مەنگەنیز و فۆسفۆر لە سپی بوونی موەكان بەرگری دەكات.

٧-بۆ پێشگرتن و چارەسەری قەبزی و كۆكە ڕەشە و ڕەبۆ و دڵەراوكێ و ئازاری ئێسكەكان و سوزەنەك و نەخۆشی پاشاكان و میزەچركە و سیل و كزانەوەی میز و بەگرانی میزكردن و یوریك ئەسید و تینوێتی و ئۆدیمای گشتی و پوكانەوەی ئێسك و ئازاری مەمك و بێ نوێژی سەخت و زەردی روخسار و صەرع و سستی لەش و شێتی و قەڵەوی و وەرەمی پرۆستات و شێرپەنجە بەكاردێت.

## ئاوی قۆخ

میزپێکەر و نەرکەرەوەیە و بەدهەرسی چارەسەر دەکات و خاسیەتی دەرمانی تریشی هەیە:

١-بۆ بەهێزکردنی توانای سێکسی و جگەر و دەمار، میزپێکەر و ڕەوانکەرە و لابەری صەفرایە و هێورکەرەوە و تفتکەری خوێنە و پاڵێوەری خوین و بەهێزکەری دەمارە.

٢-بۆ پێشگرتن و چارەسەری برینەکانی ڤاریسی و یوریای خوێن و میزەچرکە و خراپی هەرس و کۆکەرِەشە و لەکە و زیپکەی دەم و چاو و ڕەبۆ و بەردی گورچیلە و کۆلنجی گورچیلە و نەخۆشی پاشاکان و سەرمابوون بەکاردێت.

## ئاوی نارنگی:

هێورکەرەوەیە و ڤیتامینەکان و خوێ کانزاییەکانی تێدایە و ئیشتیهاهێنەرە و دەمار بەهێز دەکات و ژەهری لەش لادەبات و بەهێزکەر و چالاککەرەو چالاکیەکانی لەش زیاد دەکات.

## ئاوی نارنج

جۆرەکانی ڤیتامینی تێدایە و خاسیەتی دەرمانیشی هەیە:

١-ئاوی نارنج صەفرا لابەر و بەهێزکەری جگەر و دڵە.

٢-بۆ ئاوسانی ژێرەوەی پێڵوی چاو بەسودە.

٣-بۆ لابردنی بەردی کیسەی زراو بەکاردێت.

٤-بۆ لابردنی قەبزی بەسودە.

## ئاوی گوێزی هیندی

خاسیەتی ئەنتی بایۆتیکی هەیە و رەوانکەر و میزپێکەرەو بۆ تەشەنوجی دەماری و لاوازی دەمار و بۆنی ناخۆشی دەم و ئازاری میزەڵدان و میزەچرکە و کەمخوێنی و نەخۆشی شەکری خوێن و بۆ بەهێزکردنی بینایی و جگەر و گورچیلەو هۆی زیادکردنی شیری دایك دەبێت.

## ئاوی مۆز

چەند جۆرە ڤیتامینێکی تێدایە و ئەنتی بایۆتیکی تێدایە و خاسیەتی دەرمانی تریشی هەیە:

١-دەمار بەهێزدەکات و هیلاکی لادەبات لەگەڵ شیردا.

٢-بۆ کەمخەوی و هەروەها خوێن تفت دەکات.

٣-بۆ لاوازی لەگەڵ شیردا پێشنیاز دەکرێت.

٤-بۆ پێشگرتن لە کۆلیسترۆڵ و برینی دوانزەگرێ و گەڕی و خوران و کەمخوێنی و یوریك ئەسید و بوونی یوریا لە خوێندا و صەرع و وەرەمی گەدە و زەردی و ئەنفلۆنزا و نەخۆشی پاشاکان بەکاردێت.

## ئاوی لیمۆی شیرین

١-ئارەقهێنەرە و دژەهەوکەرە و بەهێزکەرەو بەهێزکەری دڵە و لابەری بەردی کیسەی زراوە.

٢-بۆ کەمی کاری گورچیلە و لابردنی لاوازی بەسودە.

٣-بۆ چارەسەری گرانەتا بەکاردێت.

٤-بۆ لابردنی ڕەشی ژێر چاو بەکاردێت.

٥-بۆ پێشگرتن لە ئاوی سپی و ئازاری سنگ و مێکوتە و تەنگەنەفەسی و زات الریە و سەرمابوون و نەخۆشی پاشاکان و برینی گەدە و شێرپەنجە و یوریك ئەسید و ئازاری کەمەر و یوریای خوێن بەکاردێت.

## ئاوی لیمۆ ترش

میزپێکەر و دژی نەخۆشی ئەسکەربوتە و خاسیەتی دەرمانی تریشی هەیە:

١-دژەهەوکەرە و تفتکەری خوێنە و دژی شەکری خوێن و چەوری خوێن و پەستانی خوێنە و میزپێکەرە و ڕەنکەرە و خەوهێنەرە و نیشتیها هێنەرە و زیادکەری تۆوە و نەرمکەرەوەی پێستە و زیادکەری ئاوی لیك و بەهێزکەری دڵ و گەدەیە.

٢-بۆ چارەسەری قرقینە لێدان بەکاردێت.

٣-بەرگری لە برینی گەدە و ریخۆڵە دەکات.

٤-بۆ لابردنی رەشی ژێری چاو بەکاردێت.

٥-بۆ چارەسەر و پێشگرتن لە جەڵتە و خوران و شڵی و تای هەوكردوویی و سیاتیك و زیپكەی دەم و چاو و وەرەمی ریخۆڵە و ترپەی دڵ و وەرەمی لەوزە و غازات و هیلاكی و كەڵەكەبوونی پەرەكانی خوێن و بەردی كیسەی زراو بەكاردێت.

## ئاوی گیلاس

دابینكەری توخمە كانزاییەكانی لەش و پاڵێوەری خوێنە و دژی رۆماتیزمە و بۆ توشبوان بە رەقبونی خوێنبەرەكان و پرخوێنی و نەخۆشی پاشاكان و ئیلتیهابی جومگە و بۆ رێگرتن لە زوو پیربوون و توشبوان بە ئیلتیهابی جومگە و قەڵەوی و قەبزی بەسودە و خاسیەتی دەرمانی تریشی هەیە:

١-بەڵغەم دەركەر و لابەری تا و میزپێكەرەو لابەری ژەهرە و دژی بەردی گورچیلە و میزەڵدان و بۆ بەهێزكردنی توانای سێكسی و ریخۆڵەكان و گەدە بەسودە.

٢-بۆ توشبوان بە شەكری خوێن و زەخت و چەوری خوێن بەكاردێت.

٣-بۆ پێشگرتن و چارەسەری ئیلتیهابی جومگە و وەرەمی گورچیلە و بەردی گورچیلە و میزەڵدان و چاككردنەوەی برینە ناوەكییەكان و قەبزی و ژەهراوییبون و یوریك ئەسید و نەخۆشی پاشاكان و بەردی كیسەی زراو و بەدهەرسی و رۆماتیز بەكاردێت.

## ئاوی تەماتە

لە بوارەكانی كەمبونی توخمەكانی لەش و گەشانەوە بە گەرمی و رۆماتیزم و نەخۆش پاشاكان و رەقبونی خوێنبەرەكان و بۆ رێگرتن لە زوو پیربوون بەكاردێت.

بۆ پالاوتنی خوێن و بۆ چارەسەری كەمخوێنی و وەك مقەویش بەكاردێت.

## ئاوی هەڵوژە

ڤیتامینەكانی ئەی و بی و سی و توخەمە كانزاییەكانی وەك ئاسن و مەگنسیۆم و پۆتاسیۆم و فۆسفۆر و..تێدایە.

وزەبەخش و میزپێكەرە و رەوانكەرە و دژی رەبۆیە و بۆ توشبوان بە رۆماتیزم و رەقبونی خوێنبەرەكان و هیلاكی بەكاردێت و خاسیەتی دەرمانی تریشی هەیە:

١-بۆ توشبوان بە نەخۆشی شەكرەی خوێن بەكاردێت.

٢-تفتكەری میزەو كەمكەرەوەی یوریای خوێنە و ئیشتیهاهێنەرە و بەهێزكەری نوتفە و ریخۆڵە و بینایە و دژی كۆلیسترۆڵە.

٣-بۆ چارەسەری نەخۆشی پاشاكان و رۆماتیزم بەسودە.

٤-بۆ بەرگری كردن لە كەڵەكەبوونی پەرەكانی خوێن و رەقبوونی خوێنبەرەكان و زەخت بەكاردێت.

٥-بۆ پێشگرتن و چارەسەری بەردی كیسەی زراو و ژەهراویبون و شەوكوێری و خەستی خوێن و بەردی گورچیلە و سیاتیك و قەبزی و شێرپەنجەی پرۆستات و خوێنبەربوونی پوك و شڵبوون و شێرپەنجەی سی بەكاردێت.

## ئاوی هەرمێ

مێزپێكەر و پاڵێوەری خوێنە و لابەری یوریك ئەسیدە و دابینكەری توخمە پێویستەكانی لەشە و بۆ نەخۆشی یە جیاوازەكانی وەك كەمخوێنیەكان و هیلاكی گشتی و نەخۆشی سیل و بۆ سكچونی سادە سودی هەیە و خاسیەتی دەرمانی تریشی هەیە:

١-وزەبەخش و چالاككەر و شادیهێنەر و بەهێزكەری دەمارە و بەهێزكەری توانای سێكسی یە و زیادكەری ئاوی لیكە و لابەری بێخەوییە و هێوركەرەوەی تینوێتی و بەهێزكەری حافیزە و گورچیلەكان دەبێت.

٢-بۆ بەرگری كردن لە كەڵەكەبوونی پەرەكانی خوێن و كەمخوێنی بەكاردێت.

٣-بۆ پێشگرتن و چارەسەری وەرەمی گورچیلەو رۆماتیزم و نەخۆشی شەكرە و شێرپەنجە و رەقبوونی خوێنبەرەكان و كۆلیسترۆل و لینجی خوێن و یوریك ئەسید و صەفرا و ژەهراویبونی برینی ریخۆڵە و گیرانی لوت و میزەچركە و تاڵی دەم بەكاردێت.

## ئاوی سندی

توخمە كانزایەكان و ڤیتامینەكانی بی و سی و پرۆڤیتامین ئەی و مادەی بەسودی تری تێدایە و ئیشتیهاهێنەر و پاڵێوەری خوێنە و بەهێزكەری جگەرەو لابەرێكی بەهێزی رسوباتی صەفرایە و خەستی خوێن كەم دەكاتەوە و پارێزگاری لە مولولەكانی خوێن دەكات و خوێن تفت دەكات و بۆ زەخت و قەڵەوی و نەخۆشی هەوكردن بەكاردێت.

## ئاوی کەلەرم

جۆرەکانی ڤیتامین و خوێ کانزاییەکانی وەك فۆسفۆر و کالسیۆم و مەوادی ئەنتی بایۆتیکی تێدایە و خاسیەتی دەرمانی هەیە:

١-پالێوەری خوێن و دژی کەمخوێنی و وزەبەخش و ڕێگری بەدهەرسی یە.

٢-بۆ چارەسەری برینی گەدە بەکاردێت.

٣-بۆ هێورکردنەوەی ئازاری ئەژنۆ بەسودە.

٤-بۆ توشبوان بە چەوری خوێن و پڕکاری ڕژێنی تایرۆید بەکاردێت.

٥-بۆ بەرگری لە رۆماتیزم و وەرەمی سپڵ و زەخت و تێکچونەکانی گەشەو خورانی پێستی و هەوکردنی گورچیلە و تینوێتی و سیل و شەکرە و تەشەنوج و ئیلتیهابی جومگە و ڤاریس و نارەحەتی ریخۆڵە و لەرزین بەکاردێت.

## ئاوی کەرەوس

میزپێکەرە و رسوباتی صەفرایی و بەهێزکەری دەمار و ڕژێنی گورچیلەیە و پالێوەری خوێنە و دژی رۆماتیزم و نەخۆشی پاشاکان و سیفەتی دژەهەوکەری هەیە خاسیەتی دەرمانی تریشی هەیە:

١-دژی یوریاو شەکری خوێن و چەوری خوێنە و دژەهەکەری میزەڕۆیە و پالێوەری خوێنە و تفتکەری خوێن و بەهێزکەری جگەرە و گورچیلە و دڵ و دەمارە.

٢-هاندەری ئیشتیهایە و دژی غازاتی گەدەیە.

٣-بۆ چارەسەری گەڕی و خورانی پێستی بەکاردێت.

٤-بۆ چارەسەری رۆماتیزم بەکاردێت.

٥-بۆ لابردنی ئازاری قوڕگ بەکاردێت.

٦-بۆ پێشگرتن و چارەسەری سەرمابوون و ئاوی سپی چاو و وەرەمی لەوزە و شێرپەنجە و کەڵەکەبوونی پەرەکانی خوێنی و وەرەمی گورچیلە و بەردی گورچیلە و داخرانی جگەر و سپڵ و بۆ ژەهراویبون و بەدهەرسی و برینی گەدە و تینوێتی و زەردی و زەردویی و ڕەنگ پەڕیوی و ڕەبۆ و یوریك ئەسید و نەخۆشی پاشاکان و بلۆقی دەم بەکاردێت.

## میوەكان

### ناوی میوە:هەڵوژە

تایبەتمەندییەكان: لە میوە ناسراوەكانە كە ئاماری جیاوازی هەیە، وەكو زەردی ئاڵتونی خڕە، زردێنەی هێلكە شێوە (قەترە ئاڵتون) و هەڵوژەی ڕەش. هەروەها هەڵوژە بەشێوەی تازە بەكاردەهێنرێت و هەندێ لە ئامارەكانی ئەم میوە وشكردنە بۆ خۆراكە جۆراوجۆرەكان زیاد دەكرێت.

هەروەها بەرهەمەكانی لە تیرەی كەمپوت، مرەبا و لەواشك لە ئەم میوە بەتامانە ئامادەدەكرێت. هەڵوژە لە زۆرێك لە ناوچەكانی جیهان و وڵاتی عێراق و ئێران دەچێنرێت.

خاسیەتە دەرمانییەكان:

١-زۆرێك لە ڤیتامینە جیاوازەكانە و خاوەنی پۆتاسیۆمی زۆرە.

٢- ڕەوانكەر و ئاسانكەرە و كارایی هەڵوژە بە ئەندازەیەكی زۆری دەرمانە كیمیاییەكانی دژی قەبزییە و ئەگەر بە ماوەی تەواو پێش لە خواردن بخورێت، كاریگەری باشتری هەیە. لەمەوە دەردەكەوێت كە هەڵوژە ڕەوانكەرێكی گونجاوە، خواردنی بە زۆری لە بەساڵاچوواندا پێشنیار دەكرێت، كە توشی قەبزی هاتوون.

٣- ئەگەر پێش لە خواردن بخورێت، بۆ لابردنی تینوێتی زۆر كاریگەرە و لە زیادەڕەوی لە خواردنەوەی ئاو بەرگری دەكات. بەهۆی ئەوەوە، دەردانی میز زیاد دەكات و لەم ڕووەوە، هەڵوژە بۆ توشبووان بە بەردی گورچیلە و ناڕەحەتییەكانی میزەڵدان و میزەڕۆ زۆر گونجاوە.

٤- بەكارهێنانی هەڵوژە بۆ كەسانی توشبوو بە نەخۆشییەكانی وەك كەمخوێنی، وشكی گەدە و مایەسیریش بەسودە.

بیرخستنەوە:

١-باشترە لە سەرەتای بەكارهێنانی هەڵوژە (بە تایبەت بۆ لابردنی قەبزی) لە بەكارهێنانی بڕی زیاد دووربكەونەوە و بە تەدریجی بڕی هەڵوژەی زیاد بەكاربێت. هەروەها لە سەرەتای بەكارهێنانی لەوانەیە هەندێكیان هەست بە غازات و ناڕەحەتییە سوكەكانی هەرسی بكەن،

بـەڵام پـاش كـەمێك ڕیخۆڵـەی كەسـەكە بەهەرسـكردنی هـەڵوژە ڕادێـت و كاریگەریـە باسكراوەكان لە ماوەی ٣ تا ٤ هەفتەدا چاك دەبێتەوە.

٢- مێشكی ناوكی هەڵوژە زۆر ژەهراویە و نابێت بخورێت.

## ناوی میوە: بەڵاڵوك و گیلاس

تایبەتمەندییەكان: بەڵاڵوك زیاتر لەناوچە شاخاویەكاندا سەوز دەبێت بەزۆری خۆڕسكە و لەو شوێنانەی كە تایبەتمەندییەكانی ئەم دوو میوە لێكچونێكی زۆریان بـە یـەكتر هەیـە و بـە بیروڕای هەندێ گیاناسان، ئەوانەی لەیەك شوێندا لێكۆڵینەوەی بۆ دەكەن. گیلاس، شـێوەی ڕێكخراو و گەشەپێدراوی بەڵاڵوكە.

گیلاس پێویستی بە وەسف نییە. ئەم درەختە بە گوڵەكانی سپی ڕەنگی بـەهاری و میـوەی جوان دەناسرێتەوە. درەختی بەڵاڵوك بچوكترە لە گـیلاس و بـەهۆی تـامی تـرش و گۆشـتی خۆی لە گیلاس جیادەكرێتەوە.

لە بەڵاڵوك و گیلاس بەرهەمەكانی وەك كەمپوت و شـلە، ئـاومیوە، مارمـالاد و لـواشـك ئامادە دەكرێت.

خاسیەتە دەرمانییەكان:

١)برێكی زۆر لە ڤیتامینC خاوەنی جۆررەها ڤیتامین B یەو هەروەها برێكی زۆر ڤیـتامینA (كاروتین) و هەندی توخمەكانی تیرەی ئاسن و كالیسیۆمی تێدایە.

٢)تینوێتی هێوردەكەنەوە و میزپێكەرن. بەتایبەت كوڵاوی كلكـی گـێلاس بەتونـدی میـز زیاد دەكات و بەكارهێنانی بۆ ئەوانەی كە تووشی نەخۆشی بـەردی گورچـیلە و میزەڵـدان بوون زۆر بەسودە. ئەڵبەتە باشترە كەسانی تووشـبوو بـە نەخۆشـیەكانی سـەرەوە، پـێش لـە بەكارهێنانی كوڵاوی كلكی گێلاس بە پزیشكی چارەسەرەكەریان ڕاوێژبكەن.

٣)ئاوی گیلاس بۆ چارەسەری نارەحەتیەكانی هەرس و جگەر و كەمخوێنی گونجاوە.

بیرخستنەوە:

١)لە خواردنی بەڵاڵوك و گیلاس بەبێ ماوە پـاش لـە خـواردن دووربكەونـەوە: چـونكە ڕیگری هەرسكردنی خێراو ئاسانكردنی خواردن دەبێت.

٢)كلكی گێلاس لە سێبەردا وشكبكرێتەوە، بۆ مەبەستی ئامادەكردنی بەكولاوی سوودی لێوەردەگیرێت. كلكی گێلاس چەندین خاسیەتی دەرمانی دەپارێزێت. بو ئامادەكردنی كولاوی كلكی گێلاس، كلكی گێلاس بۆماوەی یەك ڕۆژ لەناو ئاودا دادەنرێت تا نەرم ببێتەوە و لەكاتی پێویستدا ورد ورد بكرێت. یەك مشتی بچووك لەم خوسێنراوە لەیەك لیتر ئاودا بیكولێنە، ڕۆژانە ٣ تا ٤ كووپی لیّ بخورێتەوە.

## ناوی میوە: هەنار

تایبەتمەندیەكان: میوەیەكی زۆر بەتام و بەسودە كە مرۆڤ لە ڕۆژگاری كۆندا بەم میوەیە ئاشنابووە. لە نوسینە كۆنەكانی میسریەكان كە بۆ ٤٥٠٠ ساڵ لەمەوپێش دەگەڕێتەوە، وێنەی هەنار چەندەهاجار بینراوە. ئەم درەختە لە وڵاتەكانی ئەوروپایی و ئەمریكایی لە ڕووبەرێكی دیاریكراودا دەنێژرێت. بەڵام لە ناوچە فراوانەكان لە ئاسیا و ئەفریقا بوونیان هەیە. لە وڵاتی ئێران، هەنار لە زۆربەی پارێزگاكاندا دەچێنرێت و لە هەرێمی كوردستانیش ڕێژەیەكی باش هەنار هەیە. لەم میوە بە تامە بەرهەمەكانی لە گرووپی: ڕوبە هەنار، شلە، لەواشەك، شەربەت، ترشەهەنار ئامادە دەكرێت. ترشەهەنار دانە وشككراوەكانی هەنارەو كە لەباكوری هەرێمی كوردستانی عێراق و لەباكوری ئێران بۆ لێنانی هەندێك لە خواردنە خۆماڵیەكان بەكاردەهێنرێت.

سیفەتە دەرمانیەكان:

١)خاوەنی بڕێكی زۆری ڤیتامینC و شەكرە سروشتیەكانە.

٢)تینویتی چارەسەر دەكات و میزكردن زیاد دەكات.

٣)ئاوی هەناری شیرین بو تەصفیەی خوێن، لابردنی كۆكە، لابردنی گیرانی دەنگ و بەهێزكردنی جگەر و سپڵ بەسودە.

٤)ئاوی هەناری ترش و مەلەسی(نیوەترش) لە تووشبوون بە نەخۆشی شەكرەی خوێن پێشگری دەكات.

٥)چالاكی بەخشە و لاوازی جەستە كەمدەكاتەوە.

بیرخستنەوە:

١)زیادەڕەوی لە خواردنی هەناردا غازات دروست دەكات.

٢) ئاوی هەناری ترش ڕیخۆڵەکان دەڕوشێنێت و هۆی ئیلتیهاب کردنیان دەبێت، بەتایبەت ئەگەر بە گەدەی خاڵی بخورێت.

٣)زیادەڕەوی لە بەکارهێنانی هەنار لەوانەیە قەبزی دروستبکات، بەتایبەت ئەگەر دەنکەکانیشی بخورێت.

## ناوی میوە: هەنجیر

تایبەتمەندیەکان: میوەیەکی بەتامە، بەسود و بەهێزکەرە و مێژوویەکی درێژخایەنی هەیە. بەشێوەیەك کە لە زۆرینەی کتێبەکانی نووسەرە کۆنەکانی یۆنان و ڕۆم ناوی هەنجیریان تێدا بردووە. لەم ڕۆژگارەدا هەنجیر لە زۆرێك لە وڵاتانی مامناوەند و نیوە گەرمەسیر دەنێژرێت. لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا هەیە و بەشێوەیەکە تەنها بەشی دانیشتوانەکەشی ناکات و ئێرانیش درەختەکانی هەنجیر لە زۆرترین ناوچەکانیدا بونیان هەیە.

میوەی هەنجیر هەم بەشێوەی تازە و هەم وشککراوە بەکاردەهێنرێت و مرەبای بەتامیشی لێ دروستدەکرێت. لە وڵاتە ئەوروپیەکان لەگەڵ هەنجیر، هەنگوین و هەویری کاکڵە گوێز و یان لە بادام، شیرینیەکی بەتام دروستدەکەن.

سیفەتە دەرمانیەکان:

١)خاوەنی ڤیتامینەکانی گروپی B١ و C وخوێیەکانی کالیسیوم، ئاسن، پۆتاسیۆم و فۆسفۆرە.

٢)ئەم میوەیە بەسادەیی هەرس دەبێت و خواردنی هەنجیر بەتایبەت پاش لە چاکبوونەوە لە نەخۆشییە درێژخایەنەکان ڕێپێدراوە. هەنجیر یارمەتی بە هەرسکردنی خوراك دەکات.

٣)تێنوێتی چارەسەر دەکات.

٤)بەهێزکەری جگەرەو یارمەتی بە نەهێشتنی پەککەوتنی جگەر دەکات. هەروەها وەرەمی سپڵ لادەبات.

٥)لیکۆڵینەوە زانستیە تازەکان ئەوەیان دەرخستووە کە هەنجیر، لە مەوادی خۆراکی دژی شێرپەنجەیە.

٦)کوڵێنراوی خەستی هەنجیری وشك کاریگەری بە سودی لە نەهێشتنی سەرمابوونی بەردەوامدا هەیە.

٧) هەنجیری وشك بۆتی ناخۆشی دەم بەشێوەی کاتی لەناو دەبات.

٨) بە پێی بیروباوەڕە کۆنەکان هەنجیر لە میوە قەڵەوکەرەکانە.

بیرخستنەوە:

هەنجیر میوەیەکی زۆر پیرۆزە و خوای گەورە لە قورئاندا سوێنی پێخواردووە.

## ناوی میوە: تریێ

تایبەتمەندیەکان: میوەیەکی بەتامە کە هێشووە جوان و ڕەنگینەکانی تری جوانی بەخشی حاڵەتی میوەیە ومێژوویەکی زۆر درێژخایەنی هەیە. لەم ڕۆژگارەشدا لە ئاستی جیهان و ئێراندا بە بڕێکی زیاد بەرهەم دێت.لە تریێ بەدەست هێنراوەکان لە تیرەی کشمیش و مێوژ(کشمێشی ناوکەدار) سرکە،شەربەت و ئاوی گوشراوی بەرسیلە ئامادەدەکرێت.گەڵای درەختەکانی تریێ لە دروستکردنی هەندێك لە خواردنەکانی وەکو دۆڵمە بەکاردەهێنرێت.

سیفەتە دەرمانیەکان و بەدەست هێنراوەکان:

١)بڕێکی زۆر لە ڤیتامینەکانی وەکو A ، B، C خوێیەکانی پۆتاسیۆم و یۆدە.

٢)بەپێی لیکۆڵینەوە تازە زانستیەکان، تری زۆرێك لە میکرۆبەکانی ناوەوەی لەش لە نێو دەبات.

٣)لە چارەسەری ئیلتیهابی گەدە و ڕیخۆڵە و نەهێشتنی خراپی هەرسدا کاریگەرە.

٤)تریێ تازە، کشمیش و شەربەتی تریێ بۆ نەهێشتنی کەم خوێنی زۆر گونجاون.

٥)کشمیش لە باشترین شیرینیە سروشتیەکانە بۆ ڕۆژوو شکاندن.

٦)ئاوی بەرسیلە بۆ بەرگری لە قەڵەوی زیاد بەسودە.تینوێتی نەخۆشەکانی شەکرە چارەسەر دەکات و بۆ چارەسەری ڕۆماتیزم زۆر بەسودە.

٧)سرکە یارمەتی بە هەرسکردنی خواردن و هاندانی ئیشتیها دەکات.

٨)بەرگی تازە خاوەنی بڕێکی زۆری ڤیتامینC،کارۆتین(پرۆ ڤیتامینA) و مەوادی بەسودی ترە.

٩)ئەگەر ئاوی تریێ بە پێستی دەموچاودا بماڵرێت پاش لە ١٠ خولەك ئاوی لێ بدرێت، پێستی دەموچاو بەهێز و گەش دەکاتەوە، ئەڵبەتە بۆ ئەم مەبەستە، ئاوی تری دەبێت ڕاستەوخۆ پێش لە بەکارهێنان ئامادەبکرێت.

بیرخستنەوە:

١)خواردنی ئاو پاش لە تریێ، هۆی ئازاری دڵ دەبێت.ئاوی تری لە گەدە هەستیارەکان غازات دروست دەکات. ئە کەسانەی کە تووشبوون بە نارەحەتیەکانی هەرسی، نابێت ناوکەکانی تریێ و پێستی ئەستوری رووی دەنکەکانی بخۆن.

٢)زیادەرەوی لە بەکارهێنانی تریێ هۆی درووستبوونی بەردی گورچیلە دەبێت. هەرچەندێك لە تریێ ئالودە و ئافات لێدراوەکا زیاتر بەکاربهێنرێت مۆرینی لە گورچیلەکاندا خێراتر روودەدەن. لەبەرئەوە، ئەبێت تەنها لە تری تازە و سەلامەتەکان سود وەربگیرێت.

٣) سرکە بۆ تووشبوان بە نارەحەتیەکانی اعصاب، کەسە بە تەمەنەکان و تووشبوان بە نەخۆشیەکانی سی و ئازاری جومگەکان زیانبەخشە.

*کوڵێنراوی بەرگی گیا بۆ رێکخستنی ئیشی دەزگای هەرس بۆ ئامادەکردنی ئەوە یەك مشت لە بەرگی تازە یا وشککراوی گیا کە لە یەك لیتر ئاودا کوڵێنراوە رۆژانە دوو فنجانی لی دەخۆنەوە.

## ناوی میوە:بەهی

تایبەتمەندیەکان: درەختی بەهیێ لە جیهاندا بە فراوانی بلاوبوەتەوە و لە ئێراندا، زیاتر لە پارێزگاکانی باکور و باشور دەبینرێت. میوەی بەهی زیاتر بە شێوەی دروستکراو لە مرەبا و خواردنە جۆراو جۆرەکان بەکاردەهێنرێت.

سیفەتە دەرمانیەکان:

١)خاوەنی برێکی زۆری ڤیتامین a، ab١. هەر لەبەرئەمە لە هاوسەنگی دەماری رۆڵی هەیە و لە میوە خوێن دروست کەرەکان دێتە نەژمار.

٢)لە بەهیێ دەتوانی ئەو گیراوانە ئامادەبکرێت کە بۆ بەهێزکردنی گەدە و رێخوڵە و چارەسەرکردنی سکچوونی سادە بەکاردەهێنرێت. بەم رێزکردنە کە میوە گەورەکە بۆ پارچە بچووکەکان دابەشکراوە و لە چوار پەرداخ ئاو بۆ ماوەی نیوسەعات بەگەرمی مامناوەند دەکوڵێنرێن و لەم کوڵێنراوەدا بەچەند جارێك ماوەیان هەبێت دەخورێنەوە.

٣)بۆ تووشبووان بە نەخۆشیەکانی سی بەسودە و نەرمکەرەوەی سینەیە، برینەکانی گەروو چارەسەردەکات.

٤)بۆ نەهێشتنی ئیلتیهاباتی چاوە ماندوەکان و پشوودانیان دەتوانی چەند پارچەیەك بە تازەیی کە بە تەواوی بشۆرێت و پاشان ماوەیەك لەسەر رووی پێڵووە داخراوەکان دابنرێت.

٥)ناوکەکەی سیفەتێکی دەرمانی گرنگی هەیە. لە مادە لینجەکەی (بەشێوەی دەمکردوو یان کوڵێنراو) بە بڕی یەك تاسیّ دانە لە یەك فنجانی بچوك دژی کۆکە، ئازاری گەروو هەندێك نارەحەتیەکانی گەدە بەکاردەهێنرێت. لە حاڵەتی بەکارهێنانی بەردەوامی ئەم کوڵێنراوە، باشترە لەگەڵ پزیشکی چارەسەرکەر راوێژ بکرێت. هەروەها ناوکەکانی نابێت بە هیچ شێوەیەك پێش لە بە کارهێنانی بکوترێنەوە.

بیرخستنەوە:

خواردنی بەهی، بەشێوەی خاو بە تایبەتی بە نەگەیشتوویی زۆر درەنگ هەرس دەبێت و زیانمەندە.

وەك وتویانە بەهی بخۆن و بە هەدیە بە یەکتری بدەن، چونکە چاو دەبریسکێنێتەوە و هاورێیەتی لە دڵدا دەڕوێنێت. بەهی دەرخواردی خێزانە دووگیانەکانی خوتان بدەن، چونکە منداڵەکانتان باش دروست دەکات.

## ناوی میوە: پرتەقاڵ

تایبەتمەندیەکان: یەکێك لە بەناوبانگترین مزرەمەنیەکانە کە نیشتیمانی بنەڕەتی پرتەقاڵ هندستان و چین بووە وە ئێستا لە زۆربەی ناوچەکانی جیهان بوونی هەیە. لە ئێرانیشدا لە پارێزگاکانی باکوری وە بە شێك لە پارێزگا باشورییەکان باخی پرتەقاڵی فراوانیان هەیە. لە پرتەقاڵ بەرهەمهێنراوەکانی لە تیرەی شەربەت، ئاو میوە، ئیسانس و مرەبا ئامادە دەکرێت.

سیفەتە دەرمانیەکان:

١) بڕێکی زۆر لە ڤیتامین C وهەڵگری بڕێك لە ڤیتامینەکانی گرووپی B یە.خاوەنی بڕێکی زۆری خوێیە جۆراوجۆرەکانە، کەمی توخمە کانزایەکانی لەش قەرەبوو دەکاتەوە و لەوهۆیانەیە کە ئینکار ناکرێت لە بۆ نوێکردنەوەی تواناکانی گەنجێتی و سەرچاوەی وزە دێتە ئەژمار. هەر لە بەر ئەمە بەکارهێنانی بۆ هەمووان، بە تایبەت منداڵان، نەوجەوانان و کەسانێك کە سەردەمی چاکبوونەوە لە نەخۆشییەکان تێدەپەڕێنن، ئامۆژگاری بە خواردنی

دەكرێت. هەروەها بە هۆی ئەوەی كە شەكری كەمی تێدایە بۆ كەسانێك كە نەخۆشی شەكرەیان هەیە، میوەیەكی گونجاوە.

٢) لە میوە بەناوبانگەكانی دژە شێرپەنجە دەژمێردرێت. بە شێوەیەك پسپۆڕانی رێكخراوی نێودەوڵەتی دژە شێرپەنجەی ئەمریكا بڕوایان وایە كە یەكێك لەو هۆیانەی كە شێرپەنجەی گەدە لەم وڵاتەدا ئەوەندە بڵاو نیە، ئەوەیە كە مزرەمەنیەكان و بە تایبەت پرتەقاڵ لە تەواوی مانگەكانی ساڵ لە بەردەستی هاوڵاتیدایە و هەمووان لەو سود وەردەگرن.

٣) پرتەقاڵ و باقی مزرەمەنیەكان لە كەمكردنەوەی كۆڵسترۆڵی خوێن كاریگەرن و سەلامەتی خوێنبەرەكان مسۆگەر دەكەن. بە تایبەت ئەگەر لەگەڵ پیوی سپی ژێر پێستی لایە ناسكەكانی نێوان بەشەكانی ناوەوەی میوە بخورێت.

٤)هۆكاری بەهێزكردنی سیستمی دەماری دەبێت و هێوركەرەوەیە.

٥)لە چارەسەری كەم خوێنی و ( تا)كان بەهۆی سەرمابوونەوە زۆركاریگەرە.

٦) ماڵینی پارچە بڕدراوەكانی پرتەقاڵ بەسەر ڕووی پێست، هۆكاری گەشانەوەی پێست و ڕێگر دەبێت لە دەركەوتنی چرچ و لۆچی پێست.

٧)گۆشتی ئامادەكراوی پرتەقاڵ بەشێوەی مەڵهەم بۆ سارێژبوونی برینەكان و دومەڵ یارمەتیدەرە.

بیرخستنەوە:

بەپێی لیكوڵینەوە زانستیە تایبەتەكان ئاوی مزرەمەنیەكان، بە تایبەت ئاوی پرتەقاڵ ئەگەر تازە بن و لە قووتوو نەنرابن، زۆر زیاترە.

## ناوی میوە: توو

تایبەتمەندیەكان: لە باوترین میوەكانی ناوچەكانی كوردستان و وڵاتی ئێرانە كە بە دوو شێوە تووی سپی و تووی ڕەش (شا توو) بوونی هەیە. نیشتیمانی سەرەكی ئەم میوەیە، لەوانەیە ولاتی چین بێت. توو بە شێوەی وشككراوەش بەكاردەهێنرێت و جۆرێك دۆشاوی بەتام و زۆر شیرینیش لە تووی سپی ئامادەدەكرێت.

سیفەتە دەرمانیەكانی تووی سپی:

١)هەڵگری ڤیتامین C پێش ڤیتامین A ە.

٢)بەهێزکەرە، وزە بەخشە، ئیشتیهاهێنەر و قەڵەوکەرە.

٣)بۆ مەبەستی برینی گەدە، ژەهراویبوون و سکچوون سوودبەخشە.

٤)سارد، فێنککەرەوە و هێورکەرەوەی تینوێتیە.

٥)خوێن دروستکەرە.

٦)بۆ نەرمکردنەوەی سنگ، لابردنی کۆکە و نارەحەتیەکانی سی سودبەخشە.

خاسیەتە دەرمانیەکانی شاتوو:

١)هەڵگری بڕێکی زۆری ڤیتامین C و A.ە

٢)پاڵێوەری خوێنە.

٣)گرە تینوێتی دادەبەزێنێت و پەستانی خوێن تەصفیە دەکات.

٤)ئیشتیها هێنەرە.

٥)پێش لە گەیشتن قەبزی هێنەر و پاش لە گەیشتن تا ڕادەیەك ڕەوانکەرە.

بیرخستنەوە:

١) خواردنی توو، بەتایبەت تووی سپی لە پاش خواردن زیانمەندە.

٢) پاش لە خواردنی توو، بە تایبەت شاتوو، نابێت خواردنی ترش بخورێت.

٣) زیادەڕەوی لە بەکارهێنانی تووی ڕەش بۆسی و اعصاب باش نیە.

## ناوی میوە:شلیك

تایبەتمەندیەکان: میوەیەکی جوانە کە بۆن و شێوە تایبەتیەکەی ئەبێتە هۆی ئەوەی کە لایەنگرێکی زۆری هەبێت. لە دارستانەکانی باکوری ئێران بە شێوەی سروشتی بوونی هەیە کە میوەکانی وردە و بەکارهێنانی ناوچەیی هەیە و لە ناوچەکانی تریشدا لە ڕووبەری بچووکدا دەنێژرێت. میوەی شلیك لە مرەبا و شەربەت و ئامادەکردنی ئیسانس یشدا بەکاردەهێنرێت.

خاسیەتە دەرمانیەکان:

١) خاوەنی بڕێکی زۆری ڤیتامین C و خوێیەکانی کالیسیۆم، ئاسن، فوسفۆڕ، پۆتاسیۆم،، سۆدیۆم و یۆدە.

٢) بەپێی ڕای بەشێك لە شارەزایان شلیك لەوانەیە لە هەندێك لە شیرپەنجەکان ڕێگری بکات.

٣)بۆ کۆئەندامی سوڕی خوێن و دڵ بەسوودە. کۆلیسترۆڵی خوێن کەمدەکاتەوەو میوەیەکی گونجاوە بۆ ئەو کەسانەی ك پەستانی بەرزی خوێنیان هەیە.

٤)تینوێتی چارەسەر دەکات و میز هێنەریشە.

٥)چالاککەر و هێورکەرەوەیە.

٦)بۆ تووشبووان بە نارەحەتیەکانی ریخۆڵە و جگەر و نەخۆشی پاشاکان و ڕۆماتیزم و قەبزی و کەمخوێنی بەسوودە. هەروەها بۆ کەسانێك کە سوڕی چاکبوونەوە لە نەخۆشیەکان تیدەپەڕێنن ئامۆژگاری دەکرێت.

بیرخستنەوە:

١)هەندی خەڵك سەبارەت بە شلیك حەساسیەتیان هەیە و بەکارهێنانی شلیك لیر و کاریگەریەکانی پێستی لە لەشیاند دروست دەکات. ئەم کەسانە دەبێت لە بەکارهێنانی شلیك خۆیان بپارێزن.

٢)بۆ ئەوەی کە شلیك کاریگەرییە بەسودەکانی لە لەشدا زیاتر نیشان بدات، باشترە بەیانیان بە گەدەی خاڵی بخورێت و لەگەڵ شلیکدا مەوادەکانی لە جۆری خامە نەخورێت و پێش لە بەکارهێنان، بە ئاوی پاك بە باشی بشۆردرێت.

*دەمامکی دەموچاو:

ئەو کەسانەی کە سەبارەت بە شلیك حەساسیەتیان نیە، دەتوانن چەند شلیکێك پان بکەنەوە، چەند خولەکێك لەسەر دەموچاویان دای بنێن و پاشان بە ئاوی شلەتێن ئاوی لێبدەن، ئەم دەمامکە بۆ ڕەنگ و شەفافیەتی پێست زۆر گونجاوە.

**ناوی میوە: خەربزە**

تایبەتمەندیەکان:لە بنچینەدا لە سەوزەواتەکانی پەیوەست بە خێزانی کولەکەکانە کە ئامارێکی جیاوازیان هەیە. لە جۆرەکانی خەربزە، کاڵەك، شەمامە دەتوانرێت ناوببرێت کە شەمامە جۆرێکی درەنگ پێگەیشتووی کاڵەکە. سەرەڕای بەکارهێنانی میوەی خەربزە، لە ناوکە برژاوەکانی لە هەندێك لە ناوچەکان بە ناونیشانی چەرەس بەکاردەهێنرێت.

خاسیەتی دەرمانی خەربزە:

١) خاوەنی برێکی زۆر لە ڤیتامین A، B٢، C ە.ڤیتامین B٢ەکەی بە ڕادەیەك زۆرە کە کەم میوەیەك هەیە کە لەم ڕووەوە بەرامبەری بکات. بەهۆی بوونی ڤیتامینەکان و خوێیە هەمەجۆرەکان بەکارهێنانی خەربزە بو ئەو کەسانەی تووشبوون بە کەم خوێنی بەسوودە.

٢)میزهێنەرە و بەم هۆیەوە بۆ چارەسەری نەخۆشیەکانی گورچیلە و میزەڵدان بەسوودە.

٣)شیری دایکەکان زیاد دەکات.

٤)تا ڕادەیەك دژی قەبزییە.

خاسیەتە دەرمانیەکانی خەربزە:

١)خاسیەتی دژی کلۆبوونی خوێنی هەیە و خوێن ڕوون دەکاتەوە و هۆی کەمکردنەوەی مەترسی حەملەکانی دڵ دەبێت.

٢)لە ڕیزبەندی مەوادە خۆراکیەکانی دژی شێرپەنجەدا جێگای هەیە.

٣)بۆ لابردنی ژەهراویبوونی لەش و چالاکیەکانی خانەکانی پێستی بەسوودە.

بیرخستنەوە:

١) بەکارهێنانی زۆری خەربزە و کاڵەك بۆ تووشبووان بە خراپی هەرس و وەرەمی ڕیخۆڵە زیانی هەیە و هۆکاری غازات و ئازاری گەدە دەبێت لە ئەواندا. ئەم جۆرە کەسان دەبێت ئەم میوانە کەمتر بەکاربهێنن و میوەکان بە باشی بخۆن. هەروەها لەکاتی دەرکەوتنی سکچوون نابێت لە خەربزە و کاڵەك سوود وەربگرن.

٢)باشترین کاتی بەکارهێنانی ئەم میوەیە، نێوان دوو ژەمی خواردنە. هەرگیز نابێت ئەو میوانە بە گەدەی خاڵی یان بە بێ مەودا پاش لە بەکارهێنانی خواردن بخورێت.

*تایبەتمەندیەکانی کاڵەکی شیرین و بۆنخۆش: پێستی کاڵەك دەبێت بە تەواوی نەرم و پتەو و بێ لەکە بێت و بۆن و بەرامەی خۆشی بە لووت بگات و درزەکانی پێستی کاڵەکەکە بە تەواوی ڕوون و دیار بن. ئەگەر لەلای بەرامبەری تەرزی کاڵەکەکە بازنەیەکی گەورە و پڕ ڕەنگ بینرا، نیشاندەری ئەوەیە کە تامی خۆشترە.

## ناوی میوه: خورما

**تایبەتمەندیەكان:** لەو درەختانەیە زۆر سودمەندە كە مرۆڤ لە سەردەمە كۆنەكانەوە بە خورما ئاشنا بووە و لە بەرهەمە جۆربەجۆرەكانیشی سوودی وەرگرتووە. لە خانەقین و باشوری كوردستانی عێراق و لە ولاتی عێراق نزیكەی ٢٢ ملیۆن دارخورمای تیادایە، لە ئێران پێشینەی ناشتنی خورما بۆ ٣ تا ٤ هەزار ساڵ پێش لە ئێستا دەگەرێتەوە و ئێستاش ولاتی ئێمە یەكێك لە گرنگترین بەرهەمهێنەرانی ئەم میوەیە لە ئاستی جیهاندا دێتە ئەژمار. لە میوەی خورما بەدەستهێنراوی وەك: سركە، دۆشا و جۆرێكی شەكر ئامادە دەكرێت.

خاسیەتی دەرمانی:

١)خاوەنی ڤیتامینەكانی A،گرووپی B، برێكی كەمی C و E ە. هەروەها خاوەنی توخمەكانی فۆسفۆر و كالیسیۆمە، هۆكاری پتەوبوونی ئێسكەكانی لەش دەبێت و فۆسفۆر، یەكێك لە مەوادە سەرەكیە پێكهێنەرەكانی ئێسكە. بە هەمان هۆ خورما، بەهێزكەری مێشكە و لە فەرامۆشی بەرگری دەكات. زیاد لەوەش، خاوەنی توخمی مەگنسیۆمە، بە هەمان هۆ بەساڵاچووان دەبێت خورما بەكاربهێنن: چونكە لە ماوەی پیریدا، مەگنسیۆمی مێشك بە تەدریجی لەناو دەڕوات.

٢)بە ماسولكەكان هێز دەبەخشێت و بۆ وەرزشكاران خواردنێكی بەسوودە.

٣)لەچارەسەر و بەرگری لە كەمخوێنی كاریگەرە.

٤)زۆرێك لە شارەزایانی زانستی خۆراك بڕوایان وایە خواردنی خورما لە تووشبوون بە زۆرێك لە شێرپەنجەكان بەرگری دەكات. بە پێی چەند لێكۆڵینەوەیەك دەركەوتووە لەو ناوچانەی كە دارخورمایان زۆرە كە خەڵكی زیاتر لەم میوەیە سود وەردەگرن، ژمارەی تووشبووان بە هەندێك لە شێرپەنجەكان زۆركەمە.

٥) شەكری خورما یەكێك لە سەلامەتترین شەكرەكانە و خورما، لەو شیرینیانەیە زۆر گونجاوە بۆ كردنەوەی ڕۆژوو. چونكە شەكری خورما بە خێرایی لە لەشدا دەتوێتەوە و لە ئەنجامدا كەسەكە كەمتر هەست بە برسێتی دەكات. برێكی كەمتری خۆراك دەكاتە ناو لەشیەوە و مەترسی ئیلتیهاب و غازاتی گەدە كەمدەبێتەوە.

٦) دژی قەبزیە و زیادكەری دەردانی میزە.

٧) لە کوڵێنراوی چەند دانەیەك خورما لە هەندێك ئاودا، پاش لە پاڵاوتنی شەربەتێك بە دەستدێت کە بۆ نارەحەتیەکانی هەناسەدان و گیرانی سینگ و لابردنی کۆکە زۆر بەسوودە.

خوای گەورەو خاون دەسەڵات بە حەزرەتی مریم (سەلامی خوای لە سەربی)فەرموەە:(( ئەو دارخورمایە بەرەو لای خۆت ڕاوەشێنە خورمایێکی تەڕ و تازەو پاکت بۆ ئەوەرێنیٔ. ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لە سەر بێت) فەرموویەتی:ژنی سکپڕ، هیچ خوراکێك ناخوات و هیچ دەرمانێك بەکارناهێنێت کە باشتر لە خورمای تازە بێت)).

## ناوی میوە:خورمالو

تایبەتمەندیەکان: درەختانی خورمالو بەزۆری لە ناوچە گەرمیانی و نیوە گەرمیانییەکاندا بوونیان هەیە و لە سەدەکانی کۆندا لە وڵاتی چیندا دەنێژران.لەوڵاتی چین خواردنە جۆراوجۆرەکان بە خورمالو ئامادەدەکرێت.

ئەم میوەیە کاتی کە پێنەگەیشتووە، تامەکەی تاڵە، بەڵام پاش پێگەیشتن، شیرین و بەتام دەبێت. خورمالو پاش لە لێکردنەوەی لە درەخت، هەم قۆناغەکانی گەیشتن بە تەدریجی تێدەپەڕێنێت.

خاسیەتی دەرمانی:

١)خاوەنی ڤیتامینەکانی A، گروپی B، C ە.

٢)ئیشتیها هێنەرە و بۆ بەهێزکردنی گەدە بەکاردەهێنرێت.

٣)بۆ جگەر و گورچیلە بەسوودە و کەمخوێنی چارەسەردەکات.

٤)بۆ مەبەستی خێرا گەشەکردن لە منداڵاندا میوەیەکی گونجاوە.

٥)ئاوی خورمالوی پیٔ نەگەیشتوو بۆ هێنانە خوارەوەی پەستانی بەرزی خوێن زۆر کاریگەرە.

*بۆ خێرا پێگەیشتنی میوەکانی خورمالوە نیوە گەیشتووەکان پاش لە لێکردنەوەیان دەتوانرێت لە نێوانیاندا سێوێك یان دوو سێو دابنرێت.

## ناوی میوە: قەیسی

تایبەتمەندیەکان: نیشتیمانی سەرەکی درەختانی قەیسی چین و سیبریان. لەم ڕۆژگارەدا لـە زۆرێك لە ناوچەکانی جیهان دەنێژرێن. لە کوردستانیشدا بە ڕێژەیەکی دیاریکراو هەیە و لە ئێرانیشدا لە ناوچەکانی باکوری ڕۆژئاوا، ناوەڕاست و ڕۆژهەلات بوونی هەیە. لـەم میوەیـە مرەبا، کامپوت و بەرگی (قەیسی وشککراو) ئامادەدەکرێت و ناوکی پێشەکەشی لە هەندێك لە ناوچەکان، بەکارهێنانی خۆراکی هەیە.

خاسیەتی دەرمانی:

١) خاوەنی ڤیتامین C، بڕێکی زۆر لە ڤیتـامین A ە، بەشـێوەیەك کـە خـواردنی دوو دانـە قەیـسی گەورە وگەیشـتوو، نیوەی پێویستی ڕۆژانەی لەش بە ڤیتامین A دابین دەکات. بە هۆی هەبوونی ئەم ڤیتامینانە بۆ منداڵان، کەسانی کەمخوێن و کەسانێك کە نیشی فیکـری دەکـەن، بەسوودە.

٢) لەبواری ئازاری چاویشدا ئەم میوەیان پێشنیار کردووە.

٣) لیکۆڵینەوە نوێیەکان جەخت لـە سـەر ئـەوە دەکەنـەوە کـە قەیـسی لـە ڕیزبەنـدی سەرەوەی میوەکانی دژی شـێرپەنجەیە، بـە تایبـەت شـێرپەنجەی سـی و لەوانەیـە پـەنکریاس جێگەی هەبێت.

٤) تینوێتیش لا دەبات.

٥) بەرگی قەیسی زۆر خۆراکی و دروستکەری شـانەکان و ئێـسکەکانە، بـە تایبـەت بـۆ کەمخوێنی، خەمۆکی و تێکچوونە دەروونیەکان ڕێگای پێدەدرێت.

بیرخستنەوە:

١) قەیسی بەشێوەیەکی گشتی لە میوە غاز هێنەرەکان دێتە ئەژمار، بە تایبـەت ئەگـەر بـە یەکجار بڕێکی زۆری لێ بخورێت. هەرگیز نابێـت پـاش لـە خواردنـە قورسـەکان وگـەدەی خاڵی بخورێت. ئەگـەر پـاش لـە خـواردنی ئـاو بخورێـت، زۆر زیانبەخـشە. کەسـانێك کـە نارەحەتی گەدە یان جگەریان هەیـە، باشـترە کـە قەیـسی نـەخۆن یـان بـە شـێوەی مرەبـا و کامپووت بەکاری بهێنن. قەیسی نەگەیشتوو زۆر درەنگ هەرس دەبێت و بۆ تووشبووان بـە خراپی هەرس و لاوازی فرمانەکانی جگەر زیانبەخشە.

٢)بەپێی بیرو ڕای هەندێك لە شارەزایان، ناوكی پێشەی قەیسی خاوەنی جۆرێـك مـادەی ژەهریـە و بە برێكی زیاد پێشنیار ناكرێت. بە تایبەت لــە منـداڵان خـواردنی برێكـی زیـادی ناوكی پێشەی قەیسی ژەهراوی بوون دروست دەكات.

٣) قەیسی پاش لەوەی كە لــە درەخـت لێكرایـەوە، قوتاغـەكانی گەیـشتن تێناپـەڕێنێت. لەبەرئەوە، نابێت قەیسیە زۆر ڕەقەكان بكڕدرێت. هەروەها دەبێـت لــە كـڕینی قەیـسی زۆر گەیشتوو و فلیقاو جگە بۆ ئامادەكردنی مرەبا دووربكەونەوە.

## ناوی میوە:زرشك

تایبەتمەندیەكان: درەختێكی زۆر مقاوومە كە لقی چڕووپڕی هەیە. عادەتەن میوەی زرشك ووشك دەكەن و بۆ هەندێك لە خواردنەكان زیادی دەكەن.

هەروەها لەو میوە تازە و گەیشتووەكانی بەرهەمانێك لــە تـیرەی: جێلی،مرەبا،لەواشـەك و ئاوی زرشك ئامادە دەكرێت. زرشك لە هەندێك لە پارێزگاكان وەك خۆراسان بـە فراوانـی دەنێژرێت.

خاسیەتی دەرمانی:

١) خاوەنی برێكی زۆری ڤیتامین C و خوێیە كانزاییە جۆراوجۆرەكانە.

٢) بەهێزكـەری جگـەر و تورەكـەی زراوە. دەردانـی زراو ئاسـان دەكـات و زەرداوی كەڵەكەبوو لە جگەردا دەڕژێنێتە ڕیخۆڵە و خوێن پاڵێوە.

٣)هێزپێدەری دڵە.

٤)بەهێزكەری گەدە و هۆی زیادبوونی ئیشتیها دەبێت.

٥)لابەری تایە و پلەی گەرمی لەش كەمدەكاتەوە.

٦)ئەگەر برێك زرشك لە ئاودا بخوسێنن و پاش لە ٢٤ سەعات زرشـكەكان بخۆن، گـڕ وگەرمی گەدە و تینوێتی لادەبات.

٧) دژی قەبزیە و لە تێری زیاد یان بەكارهێنانی زۆر ڕەوانكەرە.

٨) ئەگەر هەندێك زرشك بكوتنـەوە و لــە ئـاودا چـەند خولـەكێك بیكـوڵێنن وگـیراوە بەدەسهاتووەكە غەرغەرەی پێ بكەن، ئازاری گەروو لادەبات و دایدەمركێنێتەوە و خواردنی ئەم گیراوەیە بۆ چارەسەری تەنگەنەفەسی بەسوودە.

بیرخستنەوە: خانمانی دووگیان دەبێت لە بەکارهێنانی زۆری زرشك خۆیان بپارێزن.

## ناوی میوە: زەیتون

تایبەتمەندیەکان:یەکێك لە کۆنترین گیاکانی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە کە لە نزیکەی پێنج هەزارساڵ لەمەوپێش نێژراوە و بەکارهێنانی جۆراوجۆری هەیە. ناوچەی زۆر و زەبەندی زەیتوون ناشتن لە ئێران لە پارێزگاکانی باکووری وڵاتدا هەن. دوو شاری ڕودبار و مەنجیل لە بەرهەمهێنەرانی گرنگی زەیتوونن. زەیتوونیش بە شێوەی ڕاستەوخۆ، لە قوتووکراو(کۆنسێرڤ) یان خۆشەکراو (تیکەڵەیەك لە زەیتون و گوێز و سیر و چەند مادەیەکی تر) بەکاردەهێنرێت و هەروەها لە زەیتوون ڕۆنێکی زۆر بەسوود دەگرن.

خاسیەتی دەرمانی:

١)ڕۆنی زەیتوون، خاوەنی پێکهاتە کیمیاییە بەسوودەکانە کە لەسەر خوێن ئاسەواری بەسوود بەجی دەهێڵێت. لە کۆمەڵێك ئامادەکاری خوێن بۆ مەیین کەمدەکاتەوە. کۆلیسترۆڵی خوێن کەمدەکاتەوە و ڕێگر دەبێت لە نیشتنی کولیسترۆڵ لە دەمارەکاندا. زانایان، ڕۆنی زەیتوون بە دەرمانێکی زۆر کاریگەر بۆ بەرگری لە حەملەکانی دڵ و تەنانەت پاش لە ڕوودانی حەملە بۆ بەرگری لە حەملەکانی دواتری دادەنێن. بۆ ئەوەی کە ڕۆنی زەیتوون کاریگەری زەمانەتی لە کەمکردنەوەی کولیسترۆڵی خوێندا هەبێت، دەبێت سەرەڕای بەکارهێنانی بەردەوامی زەیتوون لە بەکارهێنانی چەوریەکانی وەك: کەرێ، ڕۆنی حەیوانی و هێلکە خۆتان بپارێزن. بە هەرحاڵ بەکارهێنانی زەیتون بۆ کەسانێك کە چەوری لەشیان زۆرە و ترسی جەڵتەی دڵیان هەیە، ئامۆژگاری دەکرێت.

٢) بە بەکارهێنانی زەیتون و ڕۆنەکەی، هەم لە ڕیخۆڵەکان پارێزگاری دەکات و لە سەرهەڵدانەوەی برینی گەدە بەرگری دەکات. ڕۆنی زەیتوون ڕەوانکەرە و ئەگەری هەیە لە سەرەتای بەکارهێنان، سکچوون دروست بکات.

٣) ماڵینی ڕۆنی زەیتوون بە سەر پێستی لەشی منداڵانی تووشبوو بە ئێسکە نەرمە و کەمخوێنی بەسوودە و هەروەها ڕۆنی زەیتون، کزانەوە و ئازاری سوتاوی هێوردەکاتەوە. بۆ ئەم مەبەستە بە بێ مەودا پاش لە سوتان، ڕۆنی زەیتونەکە بکەن بەسەر شوێنی سوتاویەکەدا، ڕاستەوخۆ گەردی سۆدە یان خوێ بپژێنن بە سەریدا.

٤) بۆ مەبەستی کەمکردنەوەی ئازاری ددانی منداڵان لە کاتی دەرهاتن، دایك و باوك دەتوانن دەستی خۆیان بشۆن و پاشان پەنجەی خۆیان بە کەمێك لە ڕۆنی زەیتون هەڵبکێشن، بە سەر ڕوی پوکی منداڵدا بیماڵن و ئەم کارە ڕۆژی ٣ جار دووبارە بکەنەوە.

٥)گوشراوی ڕەنگ شینی گەڵای زەیتوون پەستانی خوێن بەشێوەیەکی داواکراو دێنێتە خوارەوە. ئەگەر ٣٠ _ ٢٠ دانە گەڵای زەیتون لە دوو پەرداخ ئاودا بۆ ماوەی چارەکێك بکوڵێنن و گیراوەکە بپالێون لەگەڵ کەمێك شەکر هەر ڕۆژێك بۆ ماوەی ١٠ تا ١٥ ڕۆژ بەکاربهێنن، پەستانی خوێنیان دێنێتە خوارەوە.

## ناوی میوە:سنجد

تایبەتمەندیەکان: درەختێکی بچووکە کە گوڵە ڕەنگ زەرد و زۆر بۆنخۆشەکانی هەیە میوەکەی بە شکڵ و شێوەی زەیتوون گۆشت دارە و لەگەڵ پێستی ناسکی سوور یان نارنجیدا. گۆشتی میوەی سپی نۆکی بە تامێکی کەمێ ترش و شیرینە. میوەی سنجد، بە عینوانی چەرەسات بەکاردەهێنرێت. درەختانی سنجد لە هەندێك بەرزایەکانی وڵات بە شێوەی خۆڕسك بوونیان هەیە و لە هەندێك پارێزگاکانی، وەك تاران و ئازەربایجان بە شێوەی ڕوێنراو بوونیان هەیە.

خاسیەتی دەرمانی:

١)بڕێکی زۆر لە ڤیتامین A، هەندێك ڤیتامینەکانی گرووپی B و کەمێك ڤیتامین K یەو لە ڕوانگەی خوێیەکانیشەوە دەوڵەمەندە و ڕێگری نەرمی ئێسك دەبێت.

٢)بەهێزکەری گەدە و با دەرکەرە و حاڵەتی هێڵنجدان هێوردەکاتەوە.

٣)بۆ وەستاندنەوەی سکچوون و سکچوونی خوێنی بەسوودە.

٤)دەرداني میز زیاد دەکات و لەم ڕووەوە بۆ نەخۆشیەکانی میزەڕۆ و گورچیلەکان بەسوودە.

٥)شادی بەخش و خەمڕەوێنە.

٦)بۆ چارەسەری کۆکە بەسوودە.

بیرخستنەوە:

زیادەڕەوی لە بەکارهێنانی سنجد، لەوانەیە هۆی قەبزی و خرابی هەرس بێت.

هەندێك وتویانە كە سنجد، گۆشتەكەی گۆشت دروست دەكات، پێشەكەی، ئێسك گەشە پێدەدات و پێستەكەی، پێست پەروەردە دەكات. سەرەڕای ئەمە، سنجد، گورچیلەكان گەرم دەكات، گەدە پاك ڕادەگرێت، لاق بەهێز دەكات.

## ناوی میوە: سێو

تایبەتمەندیەكان: درەختێكە كە دەوروبەری ٣ هەزار ساڵ لەمەوپێش نێژراوە و ئەمڕۆش یەكێك لە بەربلاوترین میوەكانی جیهانە، ولاتەكانی ڕوسیا، ئەمریكا، چین، فەرەنسا و ئیتالیا لە گرنگترین بەرهەمهێنەرەكانی سێون كە بەدەستهێنراوە جۆراوجۆرەكان لە سێو ئامادە دەكەن. لە ئەمریكا ٥ بەدەستهێنراوی سەرەكی لە سێو ئامادەدەكرێت كە پێكدێن لە: ئاوی سێو، سوسی سێو، تویكلی سێو، سێوی بەستوو. لە ئێران درەختی سێو لە زۆربەی ناوچەكانی ولاتدا بوونیان هەیە.

خاسیەتی دەرمانی:

١)بڕێكی زۆر لە ڤیتامین A و بڕێك ڤیتامین C، B١، هەندێ خوی كانزایەكانی تێدایە.

٢)ڕێگری درووستبوونی ترشی یوریك دەبێت لە لەشدا و بۆ نەخۆشیەكانی وەك: نەخۆشی پاشاكان، ڕۆماتیزم، ڕەقبوونی خوێنبەرەكان بەسوودە.

٣)دژەهەوكەری ڕیخۆڵەیەو هەندێكی پزیشكەكان سێوی وردكراو بە عیلاجێكی باشی دەزانن بۆ چارەسەری سكچوونی منداڵان. سێوی پێگەیشتوو كە لەگەڵ كەمێك كەرە تێكەڵ بكرێت خاسیەتی دژی قەبزی هەیە.

٤)ئاوی سێو بۆ سەرمابوون و گیرانی دەنگ و كۆكە دەرمانێكی باشە. كەسانێك كە سێو دەخۆن كەمتر تووشی نەخۆشیەكانی سەرمابوون، هەوكردنی گەروو بۆرێچكەكان دەبن. هەروەها سێو، تا بەباشی دەهێنێتە خوارەوە.

٥)بە بیروڕای زۆرێك لە شارەزایان خواردنی سێو كاریگەری دژی شێرپەنجەی هەیە.

٦)بەكارهێنانی ئەم میوە شیفا بەخشە و بە پاراستنی سەلامەتی دەزگای خوێن و دڵ یارمەتیەكی زۆر دەكات و لە كەمكردنەوەی كۆلیسترۆڵ و پەستانی خوێندا ڕۆڵی هەیە و بۆ ئەو كەسانەی كە دەیانەوێ لە شەكری خوێنی خۆیان كەمبكەنەوە، زۆر بەسوودە.

٧)سێو هێورکەرەوەو دژی بێخەویە و لە لابردنی هیلاکیەکانی جەستەیی و فیکری ئافرەتانی سکپڕ و تێکچوونە دەماریەکانیان زۆر کاریگەرە.

٨)ئەگەر برێك ئاوی سێو بە پێستی دەم وچاودا بماڵین و پاش لە چەند خولەکێك ئاوی لێبدەین، هۆی ساف و شەفاف بوونی پێست و بەرگری لە درووستبوونی چرچ و لۆچی دەکات. لە کاتەکانی سوود وەرگرتن لە دەمامکی سێو، ئەبێت بەبێ مەودا پێش لە بەکارهێنانی ئاوی سێو ئامادە بکرێت.

بیرخستنەوە:

١)زیادەڕەوی لە خواردنی سێودا، هۆی غازات دەبێت. خواردنەوەی ئاو پاش لە خواردنی ئەم میوە لە زۆرترین کەسەکاندا ئازاری دڵ دروست دەکات.

٢-خواردنی ناوکەکانی سێو بە برێکی زۆر ژەهراوییە.

## ناوی میوە:عەناب

تایبەتمەندیەکان: درەختێکی کورتە بالآیە کە لەزۆربەی ناوچەکانی ئێران، بە تایبەت لە باشوری پارێزگای خۆراسان بوونی هەیە. میوەکەی سوور و هێلکەیی شێوەیە، خاوەنی یەك ناوکی بە هاوشێوەی زەیتونە و کەمێك شیرینترە. جۆرە هەڵبژێردراوەکەی عەنابیە کە ناوکەکەیشی گەورە بوربێت. عەناب لە چەرەساتەکانە و خاسیەتە جۆراوجۆرەکانی هەیە. وتراوە ئەگەر پێش خواردن بخورێت شیاوترە.

خاسیە دەرمانی:

١)خوێن دروستکەرە و خوێن پاڵفتە دەکات. ئەم تایبەتمەندیەی عەناب لە ساڵەکانی پێش لە پزیشکی سوننەتی بواری سەرنجدان بووە. بەشێوەیەك کە (ابن سینا) لە بەرهەمە بەجێماوەکانی خۆی ئاماژەی بە عەناب کردووە. (جالینۆس)یش دەربارەی عەناب وتویەتی خەستی خوێن زیاددەکات.

٢)خاوەنی ڤیتامین C و خوی جۆراوجۆرەکانە و بۆ شۆردنی گورچیلە و میزەڵدان زۆر کاریگەرە.

٣)هێورکەرەوەی وەرەمی گەدەیە و بەهێزکەری دەزگای هەرسە وکەمێك ڕەوانکەرە و قەبزی لادەبات.

بیرخستنەوە:

عەناب بێجگە لەوەی کە بەهێزکەری گەدەیە، درەنگ هەرسیشە و لەهەندی کەسەکاندا بەکارهێنانی عەناب غازات دروست دەکات.

*لە میوەی عەناب، ئەو کوڵێنراوانە ئامادە دەکرێت کە بۆ لابردنی ئازاری سنگ و کۆکە و سەرمابوون زۆر کاریگەرە. رێگای ئامادەکردنی کوڵێنراوی عەناب بەم شێوەیەیە: ئیستیکانێك عەناب بکەنە ٢ پەرداخ ئاوی کوڵاوەو ماوەیەك ئارام بگرن تا لە پلەی گەرمی مامناوەند بەکوڵاندنی بەردەوامی بدەن و تا عەنابەکان دەئاوسێن. پاشان ناوکەکانیان بە ئاسانی لە میوەکان جیابکەنەوەو لە ئاوی کوڵاودا بیپەستێون وگیراوە بەدەستهێنراوەکە رۆژانە یەك تا دوو ئیستیکانی بخۆنەوە.

## ناوی میوە:کیوی

تایبەتمەندیەکان:میوەیەکی زۆر بەتامە کە سەرچاوەکەی وڵاتی چینە و لە ئیران پێشینەی ناشتن و بەکارهێنانی کورتە. لە میوەی کیوی دەتوانرێ بۆ ئامادەکردنی زەڵاتە، شیرینیەکان، ساردەمەنی، مرەبا، مارمالاد، جەلی، چکلێت و کەمپووت سوودوەربگیرێت. بە دەگمەن دەتوانرێ میوەیەك پەیدابکرێت کە وەك کیوی، هەڵگری چەندایەتی زۆر و جۆرەکانی ڤیتامینەکان و مەوادی کانزایی بێت.

خاسیەتی دەرمانی:لە رووی ڤیتامین C یەوە زۆر دەوڵەمەندە. بری ڤیتامین Cەکەی ١٢_١٠ هێندەی لیمۆیە و ٦٠_٣٠ هێندەی سێوە. سەرەرای ئەوە، خاوەنی ڤیتامینەکانی A، گرووپیB، ترشی فولیك، D، E، PP، خوێیەکانی زینك، فوسفۆر، صۆدیوم، پۆتاسیۆم، کلۆر، مەگنیسیۆم، کالیسیۆم، سەلفەرە.

٢) خوێن روون دەکاتەوەو لە چەوری زیاد و پەستانی خوێن بەرگری دەکات.

٣) لە سەرمابووندا، رێ لە وەرەمی لەوزە و برینی گەدە دەگرێت، میوەیەکی گونجاوە بۆ کەسانی تووشبوو بە سەرمابوون.

٤)لەبەرئەوەی کەمیوەیەکی موغەزی و موقەوییە وە دەردانی میزیش زیاد دەکات،کەسانێك کە حەزیان بە کەمکردنەوەی کێشی خۆیان هەیە. دەتوانن کیوی

بەکاربێنن بەبی ئەوەی کە لە زیادبوونی کێش ترسیان هەبێت، وەك سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی ڤیتامینەکە بەکاریبهێنن.

٥)بەکارهێنانی کیوی بۆ پێشگرتن لە ڕۆماتیزم بەسوودە، بەڵام بۆ کەسانی تووشبوو بەم نەخۆشیە زیانبەخشە.

بەکارهێنانی کیوی لە چێشت لێناندا: بۆ ترتبوونی جۆرەکانی گۆشتی سور و سپی پێش لەوەی کە لە شیش بدرێت، دەتوانری گۆشتەکان بە شێوەیەك پارچەکانی بە قەدەر ٢ سانتیمەتری لی دەربهێنرێت و کیویە فلیقینراوەکە بە لاکانی ئەو پارچانە بمالرێت و پاش لە نیوسەعات، گۆشتەکان بشۆن، تکەیەکی بەتام ئامادە دەکرێت، مانەوەی زیاتری گۆشت لەگەڵ کیوی، هۆی نەرمبوونی زیاد لە ڕادەی گۆشت و کەمبوونەوەی چۆنیتیەکەی دەبێت.

*کیوی لە بنەڕەتدا ناوی باڵندەیەکە لە زلاندنۆ کە دەنوکی تیژ و درێژ و پەڕێکی قاوەیی هەیە وتوانای فڕینی نیە. لەبەرئەوەی کە میوەی کیوی شێوەی ئەم باڵندەیەی هەیە، دانیشتوانی بنەڕەتی زلاندنۆ ئەم میوەیەشیان ناونا کیوی و وردە وردە لە سەرانسەری جیهان پەرەی سەندو ناسێنرا.

## ناوی میوە:سندی

تایبەتمەندیەکان:یەکێکی تر لە مزرەمەنیەکان کە بەکارهێنانەکەی بە ئەندازەی جۆرەکانی دیکەی مزرەمەنیەکان باو نیە، لە سندی ئاوی سندیش ئامادە دەکرێت کە خاسیەتێکی زۆری هەیە.

خاسیەتە دەرمانیەکان:

١)خاوەنی ڤیتامین C زۆر و هەندێك ڤیتامین B١ە.

٢)بۆ سەلامەتی دڵ و کۆئەندامی سوڕی خوێن زۆر کاریگەرە، چونکە کۆلیسترۆڵی خوێن کەمدەکاتەوە و خوێنیش دەپاڵێوێت، بەتایبەت ئەگەر بە گەدەی خاڵی بەکاربهێنرێت.

٣)سندیش وەك مزرەمەنیەکانی تر توانای پێشگرتنی لە بەشێکی شێرپەنجەکان و بەرگری لە مرۆڤ لە بەرامبەر توشبوون بە ئەم نەخۆشیەدا هەیە.

٤)هۆی بەهێزکردنی گەدە دەبێت و ئیشتیهاهێنەرە و هەرسی خۆراك خێرا و ئاسان دەکات.

بیرخستنەوە: بۆ سوود وەرگرتن لە ئاوی سندی باشترە شەکری تێ نەکەن و ئەگەر تامەکەشی شیاو نەبوو، کەمێك هەنگوین یان ئاوی پرتەقاڵی تێبکەن.

## ئاوی میوە:هەرمێ

تایبەتمەندیەکان: درەختێکە کە گوڵەکانی سپی یان گوڵێکی هەیە کە ڕەنگەکەی زۆر ڕوونە. هەرمێ میوەیەکی گۆشتی و گەشە وەك ڕووخساری منداڵێکی ڕووگەش وایە و خاوەنی بۆنێکی خۆشە. هەرمی ناوچەکانی کوردستان چ بەشێوەی دەستکرد و چ بەشێوەی خۆرسك هەیە و میوەی خۆماڵی ناوچەی باکوری ڕۆژئاوا و چیاکانی قەفتزە و لە ئێستادا پاش لە سێو، گرنگترین میوەی ناوکداری ئێران و دنیایە. لە هەرمێ جۆرەکانی کەمپووت، مرەبا، ئاوی میوە، جەلی ئامادە دەکرێت.

خاسیەتی دەرمانی: خاوەنی برێکی زۆر لە ڤیتامینەکانی A، B، C و خوێیەکانی وەك پۆتاسیۆمە، پۆتاسیۆم بۆ کاری دڵ و ماسولکەکانی لەش پێویستە و یارمەتی دەمارەکان دەدات تا کاروفرمانی خۆیان باشتر جێبەجێ بکەن. لەم ڕووەوە خواردنی ئەم میوەیە بۆ کەسانی بەساڵاچوو کە پێویستیان بە پۆتاسیۆمی تەواو هەیە، پێشنیاردەکرێت.

٢)هۆکاری چالاکبوونی ڕیخۆڵەکان و بەهێزکەری گەدەیە و ڕەوانکەرێکی سووکە.

٣)میزهێنەرە و هۆکاری یارمەتیدەر دەبێت بۆ چارەسەری کزانەوەی میزەڵدان و کردنەدەرەوەی یوریك ئەسید لە لەشدا.

٤)ئارام بەخش و شادی هێنەرە و هۆکاری هێوربونەوەی ڕێژەیی حاڵەتە دەماریەکان دەبێت.

٥)لە چارەسەری کەمخوێنی و هیلاکی گشتی لەش کاریگەرە و بۆ ئافرەتانی سکپڕ میوەیەکی گونجاوە.

٦)تا لابەرە و یارمەتی چاکبوونەوەی قورگە ئێشە دەدات.

بیرخستنەوە:زیادەڕەوی لە خواردنی هەرمی، بە تایبەت خواردنی ئەو هەرمێیانەی کە بە تەواوی نەگەیشتوون، لە هەندێ کەسدا غازات دروست دەکات. کەسانێك کە گەدەیەکی هەستیاریان هەیە، باشتروایە لەو هەرمێیانەی کە بە تەواوی گەیشتوون سوود وەربگرن. بەر

لە خواردنیشی پێستەکەی بگرنەوە. پاش لە خواردنی هەرمی نابێت ئاو بخورێتەوە، وە هەروەها نابێت خواردنە خەستەکان کە تینوێتی دروست دەکەن بخورێن.

## ناوی میوە: هەڵوژەی سەوز

تایبەتمەندیەکان:درەختێکی کورتەباڵایە و میوەی بچووکی ناوکداری هەیە و کە ڕەنگی میوەکانی پێش لە پێگەیشتن سەوز و تامیان ترشە، بەڵام پاش لە پێگەیشتن ئاودار و شیرین و مەیلەو ڕەنگی زەرد دەبن. درەختانی هەڵوژەی سەوز لە زۆربەی ناوچەکانی هەرێمی کوردستان و لاتی ئێراندا بونیان هەیە و لە هەندێك لە دارستانەکان بەشێوەی خۆڕسك دەبینرێن.

خاسیەتی دەرمانی:

١)نیشتیها هێنەر و ڕەوانکەرە.

٢)زیادکەری میزە و بۆ چارەسەری نارەحەتیەکانی میزەڕۆ بەسوودە.

٣)تینوێتی چارەسەردەکات و فێنککەرەوەیە.

٤) ڕۆڵی لە دابەزاندنی کۆلیسترۆڵی خوێندا هەیە.

بیرخستنەوە:

١)زیادەڕەوی لە بەکارهێنانیدا لەوانەیە هۆی ئازاری دڵ و غازات بێت.

٢)خاسیەتەکانی هەڵوژەی سەوزی نەگەیشتو بەهۆی بوونی ترشە جیاوەزەکان زیاتر لە میوە پیگەیشتووەکانە و هەروەها لە بەرامبەریشدا زیاتر غازات دەهێنێت.

## ناوی میوە:لیمۆ ترش

تایبەتمەندیەکان:لە بەناوبانگترین و بەکارهێنراوترینی مزرەمەنیەکانە کە لە ڕووبەرێکی فراوانی جیهاندا دەنێژرێت. لە درەختەکانی لیمۆ ترش زیاتر لە پارێزگاکانی باشووری ولاتی ئێراندا دەنێژرێت. یەکێك لە بەناوبانگترین لیمۆ ترش لیمۆی عەمانیە کە پێستەکەی لە خێزانەکانی تری لیمۆترش ناسکترە. عادەتەن لیمۆ ترش بۆ ئامادەکردنی ئاولیمۆ بەکاردەهێنرێت و هەندێ جاریش لە لیمۆ ترش بە شێوەی وشککراوە تۆزی لیمۆ و مرەبای پێستی لیمۆ سود وەردەگیرێت.لە زۆربەی ولاتان لە لیمۆترش کرۆکەکەی دەگرن و بۆنخۆشکەر و دژەهەوکەرە و لە ئامادەکردنی هەندێ پێویستیەکانی جوانکاریشدا بەکاردێت.

خاسیەتی دەرمانی:

١)خاوەنی ڤیتامینە جۆراوجۆرەکانە، بە تایبەت ڤیتامین C یەکی زۆری تێدایە.

٢)بۆ لابردنی هەندێك جۆری ژەهراویبوون و ڕشانەوە بەسوودە.

٣)هەرسی خۆراك ئاسان دەکات و بەهەمان هۆ لەگەڵ خواردنە چەورەکان بەکاردەهێنرێت.

٤)بەهێزکەری دڵە و پاڵێوەری خوێنە.

٥)زیادکەری دەردانی میزە و فێنککەرەوەیە.

٦)کۆلیسترۆڵی خوێن دێنێتە خوارەوە.

٧)ماڵینی پارچە بڕدراوەکانی لیمۆی تازە بە دەم وچاودا و شۆردنی پاش لە چەند خولەکێك، هۆکاری گەشبوونەوەی پێست دەبێت و بەرگری لە پیربوونی خانەکان دەکات.

بیرخستنەوە:

١)بەکارهێنانی لیمۆ یان ئاوی لیمۆ لەکاتی دەرکەوتنی هەندی لە تێکچوونە دەماریەکان قەدەغەیە.

٢)لە بەکارهێنانی لیمۆ دەبێت مامناوەندی ڕەچاوبکرێت و ئەو کەسانەی تووشبوون بە برینی گەدە و دوانزەگرێ لە خواردنی لیمۆ دووربکەونەوە، هەروەها تووشبووان بە نەخۆشی پاشاکان و ڕۆماتیزم و کەسانی کە گرژبوون و ژانی گورچیلە و بەردی گورچیلەیان هەیە.

٣) دانانی ئاولیمۆ لە بەرامبەر ڕوناکی خۆر و بۆ ماوەیەکی درێژ، بڕێك لە ڤیتامینی خۆی لەدەست دەدات. بەهەمان هۆ باشترە لەو شووشانەی کە تاریکترن و شوێنی تاریك بپارێزرێت و تا دەتوانرێت بەشێوەی تازە بەکاربهێنرێت.

*ئەگەر دایك و باوك لەکاتی دەرهاتنی ددانەکانی منداڵەکەیان، هەندی لیمۆترش بکەنە ناو ئاوی کوڵاو و پاشان پەنجەی خۆیانی پێ تەڕبکەن، ڕۆژی چەند جارێك بە شێوەی مەساج بە پوکی منداڵەکەدا بیماڵن، هۆکاری هێورکەرەوەی ئازار و خوران دەبێت.

*لیمۆنادە شیفابەخشەکان

لیمۆترش کە بەشێوەی پەڕە ناسکەکان دەبڕن، دوو یان سێ دانە لەم پەڕانە بۆ ماوەی یەك سەعات لە ئاودا دادەنێن، لەکاتی گونجاو بە هەنگوین شیرینی دەکەن. لەم لیمۆنادە ڕۆژانە ٣ تا ٤ پەرداخ بخۆنەوە.

## ناوی میوە: لیمۆی شیرین

تایبەتمەندیەکان:یەکێکی دیکە لە مزرەمەنیە ناسراوەکانە کە خاسیەتەکەی بە گشتی کەمترە لە زۆربەی مزرەمەنیەکانی تر.

خاسیەتی دەرمانی:

١)خاوەنی بڕێکی زۆر لە ڤیتامینە جۆراوجۆرەکانە، بە تایبەت ڤیتامین C و خوێیە کانزاییە جۆراوجۆرەکان و بۆ بەهێزکردنی گشتی لەش بەکاردێت.

٢)بۆ لابردنی تایەکان بەگشتی زۆر کاریگەرە و فێنککەرەوە و ئارەق هێنەرە. بۆ چارەسەری سەرمابوون و قورگەئێشەش بەسوودە.

٣)بەهۆی شیرینیەکەی، زیانەکانی لیمۆ ترشی بۆ دەمارەکان نیە.

٤)خواردنی ٦ پەرداخ لە ئاوی لیمۆی شیرین لە ڕۆژدا یارمەتی شیاو بە چارەسەری گرانەتا دەکات.

٥)بۆ مەبەستی زیادبوونی ئیشی گورچیلەکان و دەردانی میز بەسوودە.

## ناوی میوە:مۆز

تایبەتمەندیەکان:میوەی خۆماڵی ناوچەی گەرمیانی و نیمچە گەرمیانیەکانە کە لە ناوچەکانی تری جیهانەوە دەنێردرێت. مۆز جۆرە جیاوازەکانی هەیە، کە هەندێك لەوانە خاوەنی نیشاستەیەکی زیاترن و به دڵنیاییەوە دەبێت مۆز پێش لە بەکارهێنانی پاك بێت و ئەم میوە بە نەگەیشتووی دەکرێتە کارتۆنەوە چونکە ئەگەر بە پێگەیشتووی لە کارتۆن بنرێت ئەوا خراپ دەبێت.

خاسیەتی دەرمانی:

١)لە ڕووی ڤیتامین A ەوە دەوڵەمەندە و بڕێکیش ڤیتامینەکانی B٢، B١، C تێدایە سەرچاوەیەکی باشی فۆسفۆرە.

٢)کۆلیسترۆڵی خوێن کەمدەکاتەوە و کۆئەندامی سوڕی خوێن و دڵیش بەهێز دەکات.

٣)بە ڕای زانایانی هیندی لە مۆزدا، هۆیەکی شیفابەخشی بەهێز بوونی هەیە کە بۆ بەرگری لە نیلتیهابی گەدە زۆر بەسوودە و هۆکارە بۆ دروستبوونی پەڕەیەکی پارێزەر، کە

دیوارەی گەدەی داپۆشیوە و ڕێگر دەبێت لەوەی کە ترشە دەردراوەکانی گەدە ئاسەواری خراپی لەسەری هەبێت و بەم شێوەیە، چاکبوونەوەی برینەکانی گەدە خێراتر دەکات.

٤)میز زیاددەکات و تارادەیەك دژی قەبزییە.

٥)زیادەڕەوی لە بەکارهێنانی مۆزدا دەبێتە هۆی قەڵەوی.

٦)سنگ نەرم دەکات و بۆ کۆکە وشکەکان و گیرانی سنگ بەسوودە.

بیرخستنەوە:

١)مۆز غازات هێنەرە و زیادەڕەوی لە خواردنی مۆزدا ئازاری دڵ و غازات دروست دەکات.

٢)خواردنی مۆز بە گەدەی خاڵی زیانبەخشە.

٣)باشترین ڕێگای بەکارهێنانی مۆز ئەوەیە کە ماوەیەك پێش لە خواردنی پێستی بگیرێت و بکرێت بە چەند پارچەیەکەوە. بەم پێیە لەم حاڵەتەدا شیرینترە لەوکاتەی کە دەسبەجێ پاش لە پێست گرتنەوەی بخورێت.

## ناوی میوە: گوێزی هیندی

تایبەتمەندیەکان:لە گیا سەیر و سەرسوڕهێنەرەکانە کە لە جیهاندا بەکارهێنانی زۆری هەیە و ناشتنی گوێزی هیندی خاوەنی پێشینەیەکی دوورودرێژە. بەرزی درەختانی گوێزی هیندی جاروبار بە ٢٥ مەتریش دەگات و میوەکەشی لەڕووی دەرەوەی خاوەنی پێستێکی ئەستوور و ڕیشاڵێکی ڕەقە لە ناو ئەوانەدا دەنکەکەی کە لە ڕاستیدا هەمان گوێزی هیندی خۆراکی تێدایە و لە ناو دانەکەدا شیرەی گوێزی هیندی بوونی هەیە.

گوێزی هیندی لە شیرینی دروست کردندا بەکارهێنانی زۆری هەیە و هەروەها ڕۆنەکەشی لە پیشەسازی خوراکی و دەرمانیدا بەکاردەهێنرێت.

خاسیەتی دەرمانی:

١)بۆ چارەسەری کەمخوێنی بەسوودە و لەشیش بەهێزدەکات.

٢)ئیشتیهاهێنەرە و کێش زیادکەرە.

٣)میزهێنەرە و ئازاری میزەڵدان کەمدەکاتەوە.

٤)ڕەوانکەرە وبۆ چارەسەری مایەسیری بەسوودە.

٥)میوە گونجاوە بۆ تووشبووان بە نەخۆشی شەکرە.

بیرخستنەوە:

١)گوێزی هیندی کەمێك درەنگ هەرسە و زیادەڕەوی لە بەکارهێنانیدا هۆکاری خراپی هەرس دەبێت. لەم ڕووەوە دەبێت لە بەکارهێنانیدا لایەنی مامناوەندی ڕەچاوبکرێت.

٢)زیادەڕەوی لە بەکارهێنانیدا هۆکاری زیادبوونی کۆلیسترۆڵی خوێن دەبێت.

## ناوی میوە:نارنج

تایبەتمەندیەکان:یەکێکی دیکە لە مزرەمەنیەکانە کە بەکارهێنانی وەکو میوە بە تەنها هێندە باو نیە، بەڵکو ئاوەکەی دەگرن و بەعینوانی بەهاراتی زەڵاتەکان و خواردنە جیاوازەکان بەکاردەهێنرێت و پێستە وردکراوەکەشی لە ئامادەکردنی مرەبا و هەندێ خواردنەکان بەکاردەهێنرێت.گوڵەکانی نارنج کە بە بەهار نارنج بەناوبانگن زۆر بۆنیان خۆشە، لەو گوڵانە عەرەقی بەهارنارنج ئامادەدەکرێت کە لە عەرەقە بەناوبانگەکانە. سەرەڕای ئەوە بەهارنارنج دەکرێتە نێو چایی کە هۆکاری تام خۆشی و بۆنخۆشی چایی دەبێت و وە مرەبای بەهارنارنجیشی لێ ئامادە دەکرێت. نارنج لە ناوچە جیاوازەکانی باکور، باشور و باشوری ڕۆژهەڵاتی وڵاتی ئێران دەنێژرێت.

خاسیەتی دەرمانی:

١)خاوەنی بڕێکی زۆر لە ڤیتامینەکانە، بە تایبەت ڤیتامین C و خوێیە کانزاییە بەسوودەکان.

٢)بەهێزکەری گەدەیە و لە نەهێشتنی خراپی هەرسدا ڕۆڵی هەیە.

٣)کوڵێنراوی گوڵەکانی نارنج، ئارام بەخش و دژی خەمۆکییە.

٤)پێستی نارنج بە بڕێکی کەم زەرداو لابەرە و بۆ توورەکەی زراو بەسوودە.

٥)عەرەقی بەهارنارنج یەکێك لە باشترین مادە هێورکەرەوەکانە بۆ کەسانی کە حاڵەتی دڵەڕاوکێیان هەیە و گیرۆدەی بێخەوین. ئەم مادە شادی هێنەر و ئارامبەخشە.

٦)عەرەقی بەهارنارنج بەهێزکەری ئیشتیهایە و دڵەپێچە، قورقێنە و غازاتی گەدە لادەبات.

بیرخستنەوە:زیادەڕەوی لە خواردنی نارنج بۆ جگەر زیانبەخشە، بە تایبەت ئەگەر بە گەدەی خاڵی بخورێت.

## ناوی میوە:لالەنگی

تایبەتمەندیەکان: یەکێکی دیکە لە مزرەمەنیە بەناوبانگەکانە کە لە ڕووی هەندێك خاسیەتەوە زۆر هاوشێوەی پرتەقاڵە و لە ناوچەکانی باکور، باشور و باشوری ڕۆژهەلاتی ئێران و لە هەندێ لە ناوچەکانی تری جیهاندا دەنێژرێت.

خاسیەتی دەرمانی:

١)خاوەنی ڤیتامین C و خوێی کانزایی جۆراوجۆرە، ڕێژەی خوێیەکانی لالەنگی لە پرتەقاڵ کەمترە. بەلام دەوڵەمەندە بە توخمی برۆم کە هێورکەرەوەیەکی بەهێزی سیلسیلەی دەمارەکانە. بەم هۆیەوە لالەنگی میوەیەکی گونجاوە بۆ کەسانی کە تووشبوون بە تێکچوونی دەماری.

٢) خاسیەتی میکرۆب کوژی هەیە و میوەیەکی گونجاوە لەوەختی دەرکەوتنی جۆرەکانی سەرمابوون.

٣)ئیشتیهاهێنەرە و دژی غازات و دژی حاڵەتیِ هێڵنج دانە.

٤)ڕەوانکەرێکی سوکە و لە لابردنی تێکچوونەکانی گەدە بە باشی کاردەکات.

## ناوی میوە: قۆخ

تایبەتمەندیەکان: گەورەرین سەرچاوەی قۆخ ولاتی چینە و لەم ولاتەدا لە ٥ هەزار ساڵ لەمەوپێش نێژراوە و وە ئەم میوەیە لە زۆربەی ناوچەکانی جیهاندا بوونی هەیە و هەرێمی کوردستانی عێراقیش ئەم میوەی تێدا دەنێژرێت.

گوڵەکانی زۆر جوانن و کە وێنەگرتنیان لە شوێنەواری وێنەکێشانی هونەرمەندانەدا لە مەودایەکی دورەوە بەزۆری دەبینرێت.

قۆخ جۆرە جیاوازەکانی هەیە، لە کۆمەڵەی قۆخی ئاسایی وهەنجیری و شلیل و...هتد.لە هەرێمی کوردستان و ئێران زۆرتر بەشێوەی میوەی تازە بەکاردێت. بەلام لە ولاتانی وەکو یابان و چین قۆخ بۆ دروستکردنی جۆرەها شیرینی بەکاردێنن، بۆ دروستکردنی چکلێت و بسکیت بەکاردەهێنرێت.

خاسیەتی دەرمانی:

بەشێوەیەکی تەواو بە عینوانی پاڵێوەری خوێن، میزپێکەر و لابەری تا بەکاردێت و هەروەها لە چارەسەری نەخۆشییەکانی وەك کۆکەڕەشە، تەنگەنەفەسی، بەردی گورچیلە، پەڵەکانی پێست و زیپکەی دەم و چاودا بەکاردێت.

## ناوی میوە: شوتی

تایبەتمەندییەکان: بە پێچەوانەی زۆرینەی تێڕوانینی خەڵکەوە میوە نیە، بەڵکو لە سەوزەواتەکانی پەیوەست بە خێزانی کولەکەکانە کە هی پێش ٤ هەزار ساڵە کە بەهۆی تامی خۆشیەوە لە زۆربەی ناوچەکانی جیهاندا دەچێنرێت.

خاسیەتی دەرمانی:

١-ڕونکەرەوەی خوێنە و پاڵێوەریەتی و هێورکەرەوەی پەستانی بەرزی خوێنە.

٢-ئاوێکی زۆری هەیە و زیادکەری بڕی میزە.

٣-دڵخۆشکەر و شادیبەخشە.

٤-هێورکەرەوەی گەرمیە و بۆ لابردنی جۆرەکانی تا بەسودە.

٥-مێشکی ناوکەکەی یارمەتی هەرسکردنی خۆراك دەدات و سنگ نەرم دەکاتەوە.

بیرخستنەوە:

١-باشترین کاتی خواردنی شوتی نێوانی ٢ ژەمی خواردنە کە ژەمی خواردنی پێشوو هەرسکرا بێت.

خواردنی شوتی بەبێ ماوە و کاتێکی دیاریکراو پاش خواردن یان بەیانیان زۆر زیانی هەیە و تێکچون لە هەرسکردندا دروست دەکات.

٢-لەکاتی تینوێتی توند و گەرمای زیادی هەوا نابێت شوتی بخورێت.

# بەشی چوارەم

## هەندێ لە توخمە کیمیاییەکان و سیفەتەکانیان

### هایدرۆجین: hydrogen

هێمای کیمایی = H

پێکهاتەی بلوری = مسدسی

گەردیلە ژمارە = ١

چڕیی = ٠,٠٧١ گم/مۆڵ

کێشی گەردیلە = ١,٠٠٧٩٧

حاڵەتی ئۆکسان = ١

پلەی کوڵان = ٢٥٢,٧ س°

پلەی شلبونەوە = ٢٥٩,٢ س°

ئەلیکترۆنێگەتیڤ = ٢,١

گەرمای کۆتایی بەهەڵمبوون = ٠,١٠٨ کگم-کالۆری/گم-ئەتۆم

گەرمای کۆتایی شلبونەوە = ٠,٠١٤ کگم-کالۆری/گم-ئەتۆم

گەیەنەری کارەبایی= -

گەیەنەری گەرمی = ٠,٠٠٠٤ کالۆری/سم٢/سم/س°/چرکە

گەرمای تایبەت = ٣,٤٥ کالۆری/گم/س°

تیشکی کۆڤالێنت = ٠,٣٧

تیشکی کانزایی ئەتۆمی = -

تیشکی ئایۆنی بلوری = (-١) (٢,٠٨) (-)

قەبارەی گەردیلە = ١٤,١

یەکەمین وزەی یونشی = ٣١٣

پێکهاتەی ئەلیکترۆنی = $S^1$

## هیلیۆم

هێمای کیمیایی هیلیۆم = He

گەردیلە ژمارە = ٢

بارستە ژمارە= ٤,٠٠٢٦

حاڵەتی ئۆکسانی = سفر

چڕی = ٠,١٢٦

پلەی کوڵان = -٢٦٨,٩

پلەی شلبونەوە = ٢٦٩,٧

پێکهاتەی ئەلیکترۆنی = $S^{2}$

ئەلیکترۆنەگەتیڤ= -

گەرمای کۆتایی بەهەڵمبوون = ٠,٠٢٠

گەرمای کۆتایی شلبونەوە = ٠,٠٠٥

گەیەنەری کارەبایی= -

گەیەنەری گەرمی = ٠,٠٠٠٣

گەرمای تایبەت = ١,٢٥

یەکەمین وزەی یونشی = ٥٦٧

قەبارەی گەردیلە = ٣١,٨

تیشکی ئایۆنی بلوری = -

تیشکی کۆڤالێنت = -

تیشکی کانزایی ئەتۆمی = -

پێکهاتەی بلوری = مسدسی.

## لیتیۆم

هێمای کیمیایی = Li

گەردیلە ژمارە = ٣

بارستە ژمارە= ٦,٩٣٩

حاڵەتی ئۆکسانی = ١

چڕی = ٠,٥٣

پلەی کوڵان = ١٣٣٠

پلەی شلبونەوە = ١٠٨,٥

پێکهاتەی ئەلیکترۆنی = $S^{١}$٢$S^{٢}$

ئەلیکترۆنەگەتیڤ= ١

گەرمای کۆتایی بەهەڵمبوون = ٣٢,٤٨

گەرمای کۆتایی شلبونەوە = ٠,٧٢

گەیەنەری کارەبایی= ٠,١٠٨

گەیەنەری گەرمی = ٠,١٧

گەرمای تایبەت = ٠,٧٩

یەکەمین وزەی یونشی = ١٢٤

قەبارەی گەردیلە = ١٣,١

تیشکی ئایۆنی بلوری = (+١) (٠,٦٠) (-)

تیشکی کۆڤالێنت = ١,٣٤

تیشکی کانزایی لەتۆمی = ١,٥٥

پێکهاتەی بلوری = مکعبی ناوەنددار

## بیریلیۆم

هێمای کیمیایی = Be

گەردیلە ژمارە = ٤

بارستە ژمارە= ٩,٠١٢٢

حاڵەتی ئۆکسانی = ٢

چڕی = ١,٥٨

پلەی کوڵان = ٢٢٧٠

پلەی شلبونەوە = ١٢٧٧

پێکهاتەی ئەلیکترۆنی = $S^{2}2S^{2}$

ئەلیکترۆنەگەتیف= ١,٥

گەرمای کۆتایی بەهەڵمبوون = ٧٣,٩

گەرمای کۆتایی شلبونەوە = ٢,٨

گەیەنەری کارەبایی= ٠,٢٥

گەیەنەری گەرمی = ٠,٣٨

گەرمای تایبەت = ٠,٤٥

یەکەمین وزەی یونشی = ٢١٥

قەبارەی گەردیلە = ٥

تیشکی ئایۆنی بلوری = (+٢) ٠,٣١ (−)

تیشکی کۆڤالێنت = ٠,٩٠

تیشکی کانزایی ئەتۆمی = ١,١٢

پێکهاتەی بلوری = مسدسی

## بۆرۆن

هێمای کیمیایی = B

گەردیلە ژمارە = ٥

بارستە ژمارە= ١٠,٨١١

حاڵەتی ئۆکسانی = ٣

چڕی = ٢,٣٤

پلەی کوڵان = –

پلەی شلبونەوە = ٢٠٣٠

پێکهاتەی ئەلیکترۆنی = $S^{2}2S^{2}2P^{1}$

ئەلیکترۆنەگەتیف= ٢

گەرمای کۆتایی بەهەڵمبوون = ٧٥

گەرمای کۆتایی شلبونەوە = ٥,٣

گەیەنەری کارەبایی= ١٠$^{-١٢}$

گەیەنەری گەرمی = −

گەرمای تایبەت = ٠,٣٠٩

یەکەمین وزەی یونشی = ١٩١

قەبارەی گەردیلە = ٤,٦

تیشکی ئایۆنی بلوری = (٢+) ٠,٢٠ (−)

تیشکی کۆڤالێنت = ٠,٨٢

تیشکی کانزایی ئەتۆمی = ٠,٩٨

پێکهاتەی بلوری = مسدسی

## کاربۆن

هێمای کیمیایی = C

گەردیلە ژمارە = ٦

بارستە ژمارە= ١٢,٠١١١

حاڵەتی ئۆکسانی = ٢، ٤ ≠

چڕی = ٢,٢٦

پلەی کوڵان = ٤٨٣٠

پلەی شلبونەوە = ٣٧٢٧

پێکهاتەی ئەلیکترۆنی = $S^{٢}٢S^{٢}٢P^{٢}$

ئەلیکترۆنەگەتیڤ= ٢,٥

گەرمای کۆتایی بەهەڵمبوون = ١١٧,٧

گەرمای کۆتایی شلبونەوە = −

گەیەنەری کارەبایی= ٠,٠٠٠٧

گەیەنەری گەرمی = ٠,٠٥٧

گەرمای تایبەت =.١٦٥,٠

یەکەمین وزەی یونشی = ٢٦٠

قەبارەی گەردیلە = ٥,٣

تیشکی ئایۆنی بلوری = (-٤) ٢,٦٠ (+٤) ٠,١٥

تیشکی کۆڤالێنت = ٠,٧٧

تیشکی کانزایی ئەتۆمی = ٠,٩١٤

پێکهاتەی بلوری = مسدسی

## نایترۆجین

هێمای کیمیایی = N

گەردیلە ژمارە = ٧

بارستە ژمارە= ١٤,٠٠٦٧

حاڵەتی ئۆکسانی = ٢، ٤، ٥، ٣ ∓

چڕی = ٠,٨١

پلەی کوڵان = -١٩٥,٨

پلەی شلبونەوە = -٢١٠

پێکهاتەی ئەلیکترۆنی = $S^2 2S^2 2P^3$

ئەلیکترۆنەگەتیف= ٣

گەرمای کۆتایی بەهەڵمبوون = ٠,٦٦٦

گەرمای کۆتایی شلبونەوە = ٠,٠٨٦

گەیەنەری کارەبایی= -

گەیەنەری گەرمی = ٠,٠٠٠٠٦

گەرمای تایبەت = ٠,٢٤٧

یەکەمین وزەی یونشی = ٣٣٦

قەبارەی گەردیلە = ١٧,٣

تیشكی ئایۆنی بلوری = (-٣) ١,٧١ (+٥) ٠,١١

تیشكی كۆڤالێنت = ٠,٧٥

تیشكی كانزایی ئەتۆمی = ٠,٩٢

پێكهاتەی بلوری = مسدسی

## ئۆكسجین

هێمای كیمیایی = O

گەردیلە ژمارە = ٨

بارستە ژمارە= ١٥,٩٩٩٤

حاڵەتی ئۆكسانی = -٢

چڕی = ١,١٤

پلەی كوڵان = -١٨٣

پلەی شلبونەوە = -٢١٨,٨

پێكهاتەی ئەلیكترۆنی = $S^{٢}٢S^{٢}٢P^{٤}$

ئەلیكترۆنەگەتیڤ= ٣,٥

گەرمای كۆتایی بەهەڵمبون = ٠,٨١٥

گەرمای كۆتایی شلبونەوە = ٠,٠٥٣

گەیەنەری كارەبایی= -

گەیەنەری گەرمی = ٠,٠٠٠٠٦

گەرمای تایبەت = ٠,٢١٨

یەكەمین وزەی یونشی = ٣١٤

قەبارەی گەردیلە = ١٤

تیشكی ئایۆنی بلوری = (+٦) (٠,٠٩) (-٢) (١,٤٠)

تیشكی كۆڤالێنت = ٠,٧٣

تیشكی كانزایی ئەتۆمی = -

پێكهاتەی بلوری = راستلوزی

## فلۆر

هێمای کیمیایی = F

گەردیلە ژمارە = ٩

بارستە ژمارە= ١٨,٩٩٨٤

حاڵەتی ئۆکسانی = -١

چڕی = ١,١١

پلەی کوڵان = -١٨٨,٢

پلەی شلبونەوە = -٢١٩,٦

پێکهاتەی ئەلیکترۆنی = $S^2 2S^2 2P^5$

ئەلیکترۆنەگەتیف= ٤

گەرمای کۆتایی بەهەڵمبون = ٠,٧٥٥

گەرمای کۆتایی شلبونەوە = ٠,٠٦١

گەیەنەری کارەبایی= -

گەیەنەری گەرمی = -

گەرمای تایبەت = ٠,١٨

یەکەمین وزەی یونشی = ٤٠٢

قەبارەی گەردیلە = ١٧,١

تیشکی ئایۆنی بلوری = (+٧) ٠,٠٧ (-١) ١,٣٦

تیشکی کۆڤالێنت = ٠,٧٢

تیشکی کانزایی ئەتۆمی = -

## نیۆن

هێمای کیمیایی = Ne

گەردیلە ژمارە = ١٠

بارستە ژمارە= ٢٠,١٨٣

حاڵەتی ئۆکسانی = سفر

چڕی = ١,٢٠

پلەی کوڵان = -٢٤٦

پلەی شلبونەوە = -٢٤٨,٦

پێکهاتەی ئەلیکترۆنی = $S^2 2S^2 2P^6$

ئەلیکترۆنەگەتیڤ= -

گەرمای کۆتایی بەهەڵمبوون = ٠,٤٣١

گەرمای کۆتایی شلبونەوە = ٠,٠٨٠

گەیەنەری کارەبایی= -

گەیەنەری گەرمی = ٠,٠٠٠١

گەرمای تایبەت = -

یەکەمین وزەی یونشی = ٤٩٧

قەبارەی گەردیلە = ١٦,٨

تیشکی ئایۆنی بلوری = -

تیشکی کۆڤالێنت = ١,٣١

تیشکی کانزایی ئەتۆمی = -

پێکهاتەی بلوری = مکعبی بە ڕووە ناوەند دارەکان

## صۆدیۆم

هێمای کیمیایی = Na

گەردیلە ژمارە = ١١

بارستە ژمارە= ٢٢,٩٨٩٨

حاڵەتی ئۆکسانی = ١

چڕی = ٠,٩٧

پلەی کوڵان = ٨٩٢

پلەی شلبونەوە = ٩٧,٨

پێکهاتەی ئەلیکترۆنی = {Ne}٣S١

ئەلیکترۆنەگەتیف= ٠,٩

گەرمای کۆتایی بەهەڵمبوون = ٢٤,١٢

گەرمای کۆتایی شلبونەوە = ٠,٦٢

گەیەنەری کارەبایی= ٠,٢١٨

گەیەنەری گەرمی = ٠,٣٢

گەرمای تایبەت = ٠,٢٩٥

یەکەمین وزەی یونشی = ١١٩

قەبارەی گەردیلە = ٢٣,٧

تیشکی ئایۆنی بلوری = (−) (+١) ٠,٩٥

تیشکی کۆڤالێنت = ١,٥٤

تیشکی کانزایی ئەتۆمی = ١,٩٠

پێکهاتەی بلوری = مکعبی ناوەند دار

## مەگنسیۆم

هێمای کیمیایی = Mg

گەردیلە ژمارە = ١٢

بارستە ژمارە= ٢٤,٣١٢

حاڵەتی ئۆکسانی = ٢

چڕی = ١,٧٤

پلەی کوڵان = ١١٠٧

پلەی شلبونەوە = ٦٥٠

پێکهاتەی ئەلیکترۆنی = {Ne}٣S٢

ئەلیکترۆنەگەتیف= ١,٢

گەرمای کۆتایی بەهەڵمبوون = ٣٢,٥١٧

گەرمای کۆتایی شلبونەوە = ٢,١٤

گەیەنەری کارەبایی= ٠,٢٢٤

گەیەنەری گەرمی = ٠,٣٨

گەرمای تایبەت = ٠,٢٥

یەکەمین وزەی یونشی = ١٧٦

قەبارەی گەردیلە = ١٤

تیشکی ئایۆنی بلوری = (−) (+٢) ٠,٦٥

تیشکی کۆڤالێنت = ١,٣٠

تیشکی کانزایی ئەتۆمی = ١,٦٠

پێکهاتەی بلوری = مسدسی

**ئەلەمنیۆم**

هێمای کیمیایی = Al

گەردیلە ژمارە = ١٣

بارستە ژمارە= ٢٦,٩٨١٥

حاڵەتی ئۆکسانی = ٣

چڕی = ٢,٧٠

پلەی کوڵان = ٢٤٥٠

پلەی شلبونەوە = ٦٦٠

پێکهاتەی ئەلیکترۆنی = {Ne}٣S٢٣P١

ئەلیکترۆنەگەتیڤ= ١,٥

گەرمای کۆتایی بەهەڵمبوون = ٦٧,٩

گەرمای کۆتایی شلبونەوە = ٢,٥٥

گەیەنەری کارەبایی= ٠,٣٨٢

گەیەنەری گەرمی = ٠,٥٠

گەرمای تایبەت = ٠,٢١٥

یەکەمین وزەی یونشی = ١٣٨

قەبارەی گەردیلە = ١٠

تیشکی ئایۆنی بلوری = - (٣+) ٠,٥٠

تیشکی کۆڤالێنت = ١,١٨

تیشکی کانزایی ئەتۆمی = ١,٤٣

پێکهاتەی بلوری = مکعبی بە ڕووە ناوەند دارەکان.

## سیلیکۆن

هێمای کیمیایی = Si

گەردیلە ژمارە = ١٤

بارستە ژمارە= ٢٨,٠٨٦

حاڵەتی ئۆکسانی = ٤

چڕی = ٢,٣٣

پلەی کوڵان = ٢٦٨٠

پلەی شلبونەوە = ١٤١٠

پێکهاتەی ئەلیکترۆنی = $\{Ne\}٣S^{٢}٣P^{٢}$

ئەلیکترۆنەگەتیف= ١,٨

گەرمای کۆتایی بەهەڵمبوون = ٤٠,٦

گەرمای کۆتایی شلبونەوە = ١١,١

گەیەنەری کارەبایی= ٠,١٠

گەیەنەری گەرمی = ٠,٢٠

گەرمای تایبەت = ٠,١٦٢

یەکەمین وزەی یونشی = ١٨٨

قەبارەی گەردیلە = ١٢,١

تیشکی ئایۆنی بلوری = (+٤) ٠,٤١ (-١) ٢,٧١

تیشکی کۆڤالێنت = ١,١١

تیشکی کانزایی ئەتۆمی = ١,٣٢

پێکهاتەی بلوری = هەشت ڕوویی ئەڵماسی.

## فۆسفۆر

هێمای کیمیایی = P

گەردیلە ژمارە = ١٥

بارستە ژمارە= ٣٠,٩٧٣٨

حاڵەتی ئۆکسانی = ٤، ٥، ٣ ∓

چڕی = ١,٨٢

پلەی کوڵان = ٢٨٠

پلەی شلبونەوە = ٤٤,٢

پێکهاتەی ئەلیکترۆنی = {Ne}٣S٢٣P٣

ئەلیکترۆنەگەتیڤ= ٢,١

گەرمای کۆتایی بەهەڵمبون = ٢,٩٧

گەرمای کۆتایی شلبونەوە = ٠,١٥

گەیەنەری کارەبایی= ١٠ ^-١٧

گەیەنەری گەرمی = -

گەرمای تایبەت = ٠,١٧٧

یەکەمین وزەی یونشی = ٢٥٤

قەبارەی گەردیلە = ١٧

تیشکی ئایۆنی بلوری = (+٥) ٠,٣٤ (+٣) ٢,١٢

تیشکی کۆڤالێنت = ١,٠٦

تیشکی کانزایی ئەتۆمی = ١,٢٨

پێکهاتەی بلوری = مکعبی

## گۆگرد

هێمای کیمیایی = S

گەردیلە ژمارە = ١٦

بارستە ژمارە= ٣٢,٠٦٤

حاڵەتی ئۆکسانی = -٢، ٤، ٣، ٦

چڕی = ٢,٠٧

پلەی کولآن = ٤٤٤,٦

پلەی شلبونەوە = ١١٩

پێکهاتەی ئەلیکترۆنی = $\{Ne\}٣S^{٢}٣P^{٤}$

ئەلیکترۆنەگەتیف= ٢,٥

گەرمای کۆتایی بەهەڵمبوون = ٣,٠١

گەرمای کۆتایی شلبونەوە = ٠,٣٤

گەیەنەری کارەبایی= $١٠^{-٢٣}$

گەیەنەری گەرمی = ٠,٠٠٠٧

گەرمای تایبەت = ٠,١٧٥

یەکەمین وزەی یونشی = ٢٣٩

قەبارەی گەردیلە = ١٥,٥

تیشکی نایۆنی بلوری = (+٦) ٠,٢٩ (-٢) ١,٨٤

تیشکی کۆڤالێنت = ١,٠٢

تیشکی کانزایی ئەتۆمی = ١,٢٧

پێکهاتەی بلوری = مکعبی

## کلۆر

هێمای کیمیایی = Cl

گەردیلە ژمارە = ١٧

بارستە ژمارە= ٣٥,٤٥٣

حاڵەتی ئۆكسانی = ١،٤،٥،٦،٧ ≠

چڕی = ١,٥٦

پلەی كوڵان = -٣٤,٧

پلەی شلبونەوە = -١٠١

پێكهاتەی ئەلیكترۆنی = $\{Ne\}3S^2 3P^5$

ئەلیكترۆنەگەتیف= ٣

گەرمای كۆتایی بەهەڵمبوون = ٢,٤٤

گەرمای كۆتایی شلبونەوە = ٠,٧٧

گەیەنەری كارەبایی= –

گەیەنەری گەرمی = ٠,٠٠٠٠٢

گەرمای تایبەت = ٠,١١٦

یەكەمین وزەی یونشی = ٣,٠٠

قەبارەی گەردیلە = ١٨,٧

تیشكی ئایۆنی بلوری = (+٧) ٠,٣٩ (-١) ١,٩٥

تیشكی كۆڤالێنت = ٠,٩٩

تیشكی كانزایی ئەتۆمی = –

پێكهاتەی بلوری = مربعی

## ئارگۆن

هێمای كیمیایی = Ar

گەردیلە ژمارە = ١٨

بارستە ژمارە= ٣٩,٩٤٨

حاڵەتی ئۆكسانی = سفر

چڕی = ١,٤٠

پلەی کوڵان = -١٨٥,٨

پلەی شلبونەوە = ١٨٩,٤

پێکهاتەی ئەلیکترۆنی = {Ne}٣S٢٣P٦

ئەلیکترۆنەگەتیڤ= -

گەرمای کۆتایی بەهەڵمبون = ١,٥٦

گەرمای کۆتایی شلبونەوە = ٠,٢٨١

گەیەنەری کارەبایی= -

گەیەنەری گەرمی = ٠,٠٠٠١

گەرمای تایبەت = -

یەکەمین وزەی یونشی = ٣٦٣

قەبارەی گەردیلە = ٢٤,٢

تیشکی ئایۆنی بلوری = -

تیشکی کۆڤالێنت = ١,٧٤

تیشکی کانزایی ئەتۆمی = -

پێکهاتەی بلوری = مکعبی لەگەڵ ڕووە ناوەند دارەکان

## پۆتاسیۆم

هێمای کیمیایی = K

گەردیلە ژمارە = ١٩

بارستە ژمارە= ٣٩,١٠٢

حاڵەتی ئۆکسـانی = ١

چڕی = ٠,٨٦

پلەی کوڵان = ٧٦٠

پلەی شلبونەوە = ٦٣,٧

پێکهاتەی ئەلیکترۆنی = {Ar}٤S١

ئەلیکترۆنەگەتیف= ٠,٨

گەرمای کۆتایی بەهەڵمبوون = ١٨,٩

گەرمای کۆتایی شلبونەوە = ٠,٥٥

گەیەنەری کارەبایی= ٠,١٤٣

گەیەنەری گەرمی = ٠,٢٣

گەرمای تایبەت = ٠,١٧٧

یەکەمین وزەی یونشی = ١٠٠

قەبارەی گەردیلە = ٤٥.٣

تیشکی ئایۆنی بلوری = - (+١) ١,٣٣

تیشکی کۆڤالێنت = ١.٩٦

تیشکی کانزایی ئەتۆمی = ٢,٣٥

پێکهاتەی بلوری = مکعبی ناوەند دار

## کالسیۆم

هێمای کیمیایی = Ca

گەردیلە ژمارە = ٢٠

بارستە ژمارە= ٤٠,٠٨

حاڵەتی ئۆکسانی = ٢

چڕی = ١,٥٥

پلەی کوڵان = ١٤٤٠

پلەی شلبونەوە = ٨٣٨

پێکهاتەی ئەلیکترۆنی = $\{Ar\}٤S^{٢}$

ئەلیکترۆنەگەتیف= ١

گەرمای کۆتایی بەهەڵمبوون = ٣٦,٧٤

گەرمای کۆتایی شلبونەوە = ٢,١

گەیەنەری کارەبایی= ٠,٢١٨

گەیەنەری گەرمی = ٠,٣

گەرمای تایبەت = ٠,١٤٩

یەکەمین وزەی یونشی = ١٤١

قەبارەی گەردیلە = ٢٩,٩

تیشکی ئایۆنی بلوری = - (+٢) ٠,٩٩

تیشکی کۆڤالێنت = ١,٧٤

تیشکی کانزایی ئەتۆمی = ١,٩٧

پێکهاتەی بلوری = مکعبی لەگەڵ ڕووە ناوەند دارەکان

## سکاندیۆم

هێمای کیمیایی هیلیۆم = Sc

گەردیلە ژمارە = ٢١

بارستە ژمارە= ٤٤,٩٥٦

حاڵەتی ئۆکسانی = ٣

چڕی = ٣

پلەی کوڵان = ٢٧٣٠

پلەی شلبونەوە = ١٥٣٩

پێکهاتەی ئەلیکترۆنی = $\{Ar\}٣d^{١}٤S^{٢}$

ئەلیکترۆنەگەتیف= ١,٣

گەرمای کۆتایی بەهەڵمبوون = ٨١

گەرمای کۆتایی شلبونەوە = ٣,٨

گەیەنەری کارەبایی= ٠,٠١٥

گەیەنەری گەرمی = ٠,٠١٥

گەرمای تایبەت = ٠,١٣

یەکەمین وزەی یونشی = ١٥١

قەبارەی گەردیلە = ١٥

تیشکی ئایۆنی بلوری = – (+٣) ٠,٨١

تیشکی کۆڤالێنت = ١,٤٤

تیشکی کانزایی ئەتۆمی = ١,٦٢

پێکهاتەی بلوری = مسدسی

## تیتانیۆم

هێمای کیمیایی = Ti

گەردیلە ژمارە = ٢٢

بارستە ژمارە= ٤٧,٩٠

حاڵەتی ئۆکسانی = ٣،٤

چڕی = ٤,٥١

پلەی کوڵان = ٣٢٦٠

پلەی شلبونەوە = ١٦٦٨

پێکهاتەی ئەلیکترۆنی = {Ar}٣d٢٤S٢

ئەلیکترۆنەگەتیڤ= ١,٥

گەرمای کۆتایی بەهەڵمبون = ١٠٦,٥

گەرمای کۆتایی شلبونەوە = ٣,٧

گەیەنەری کارەبایی= ٠,٠٢٤

گەیەنەری گەرمی = –

گەرمای تایبەت = ٠,١٢٦

یەکەمین وزەی یونشی = ١٥٨

قەبارەی گەردیلە = ١,٠٦

تیشکی ئایۆنی بلوری = (+٤) ٠,٦٨ (+٢) ٠,٩٠

تیشکی کۆڤالێنت = ١,٣٦

تیشکی کانزایی ئەتۆمی = ١,٤٧

پێکهاتەی بلوری = مسدسی

## ڤانادیۆم

هێمای کیمیایی = V

گەردیلە ژمارە = ٢٣

بارستە ژمارە= ٥٠,٩٤٢

حاڵەتی ئۆکسانی = ٢، ٣،٤، ٥

چڕی = ٦,١

پلەی کوڵان = ٣٤٥٠

پلەی شلبونەوە = ١٩٠٠

پێکهاتەی ئەلیکترۆنی = $\{Ar\}٣d^{٣}٤S^{٢}$

ئەلیکترۆنەگەتیڤ= ١,٦

گەرمای کۆتایی بەهەڵمبوون = ١٠٦

گەرمای کۆتایی شلبونەوە = ٤,٢

گەیەنەری کارەبایی= ٠,٠٤

گەیەنەری گەرمی = –

گەرمای تایبەت = ٠,١٢٠

یەکەمین وزەی یونشی = ١٥٦

قەبارەی گەردیلە = ٨,٣٥

تیشکی ئایۆنی بلوری = (+٥) ٠,٥٩ (+٣) ٠,٧٤

تیشکی کۆڤالێنت = –

تیشکی کانزایی ئەتۆمی = ١,٣٤

پێکهاتەی بلوری = مکعبی ناوەند دار

## کرۆم

هێمای کیمیایی = Cr

گەردیلە ژمارە = ٢٤

بارستە ژمارە= ٥١,٩٩٦

حاڵەتی ئۆکسانی = ٢، ٣، ٦

چڕی = ٧,١٩

پلەی کوڵان = ٢٦٦٥

پلەی شلبونەوە = ١٨٧٥

پێکهاتەی ئەلیکترۆنی = {Ar}٣d٥٤S١

ئەلیکترۆنەگەتیف= ١,٦

گەرمای کۆتایی بەهەڵمبون = ٧٢,٩٧

گەرمای کۆتایی شلبونەوە = ٣,٣

گەیەنەری کارەبایی= ٠,٠٧٨

گەیەنەری گەرمی = ٠,١٦

گەرمای تایبەت = ٠,١١

یەکەمین وزەی یونشی = ١٥٦

قەبارەی گەردیلە = ٧,٢٣

تیشکی ئایۆنی بلوری = (+٦) ٠,٥٢ (+٣) ٠,٦٩

تیشکی کۆڤالێنت = –

تیشکی کانزایی ئەتۆمی = ١,٢٧

پێکهاتەی بلوری = مکعبی ناوەند دار.

## مەنگەنیز

هێمای کیمیایی = Mn

گەردیلە ژمارە = ٢٥

بارستە ژمارە= ٥٤,٩٣٨

حاڵەتی ئۆكسانی = ٣، ٢، ٤، ٦، ٧

چڕی = ٧,٤٣

پلەی كوڵان = ٢١٥٠

پلەی شلبونەوە = ١٢٤٥

پێكهاتەی ئەلیكترۆنی = $\{Ar\}٣d^٥٤S^٢$

ئەلیكترۆنەگەتیف= ١,٥

گەرمای كۆتایی بەهەڵمبوون = ٥٣,٧

گەرمای كۆتایی شلبونەوە = ٣,٥٠

گەیەنەری كارەبایی= ٠,٠٥٤

گەیەنەری گەرمی = –

گەرمای تایبەت = ٠,١١٥

یەكەمین وزەی یونشی = ١٧١

قەبارەی گەردیلە = ٧,٣٩

تیشكی ئایۆنی بلوری = (+٧) ٠,٤٦ (+٢) ٠,٨٠

تیشكی كۆڤالێنت = –

تیشكی كانزایی ئەتۆمی = ١,٢٦

پێكهاتەی بلوری = راستلوزی.

# بەشی پێنجەم

## پـــۆلێنکردنی دەرمانـــەکان لـــە ڕووی چارەســـەرییەوە:

## THERAPEUTIC CLASSIFICATION OF DRUGS

دەرمانەکان پۆلێن دەکرێن لە ڕووی چارەسەرییەوە بەهۆی ئەو نەخۆشیانەی دەرمانەکە چارەسەری دەکات یان ڕێگری لێ دەکات یان دژییەتی یان هێوری دەکاتەوە یان ئەبێتەهۆی کوشتنی جۆرێك وردەزیندەوەر وەك بەکتریا و ڤایرۆس و کەڕوو و یان دەبێتەهۆی ڕگرتن لە گەشەیان و...هتد.

بۆنمونە دەرمان هەیە دژی هەوکردن بەکاردێت چی بەهۆی ڤایرۆس یان کەڕوو یان بەکتریا یان مشەخۆرەکان و وردە زیندەوەرەکانی تر و کرمەکانەوە بێت وەك ئەلبێندازۆڵ دژی کرمەکانە وە مێترۆنیدازۆڵ دژی ئەمیبایە یان ئەسیکلۆڤیر دژی تامێسکە یان پاراسیتامۆڵ دژی ئازارە یان ئەباکاڤیر دژی ڤایرۆسی ئایدزە بەڵام چارەسەری ناکات تەنها ڕێ لە گەشەی دەگرێت و نایەڵێت ڤایرۆسە شریتی DNA تەواو دروست بکات.

لێرەدا مەبەستمان ئەوەیە کە دەرمانەکان پۆلێن کراون بەپێی گروپی چارەسەرییان واتە بەپێی ئەو نەخۆشیەی دەرمانەکەی بۆ بەکاردێت نەخۆشییەکە بەم دەرمانە چارەسەر دەکرێت. بۆ نمونە دەرمانی ڕانیتیدین پێی دەوترێت درەمانی دژەبرینی گەدە و دوانزەگرێ چونکە دژی ئەو نەخۆشییە بەکاردێت و چارەسەری دەکات.

وە زۆربەی دەرمانەکانی تریش بە هەمان شێوەن بۆ نمونە دەرمانی زۆپیکلۆن دژی بێخەوییە و دەرمانی زەفیرلوکاست دژی ڕەبۆیە و...هتد.

لەڕووی چارەسەرییەوە دەکرێت دوو دەرمان پێکەوە بەکاربێنین، ئەویش بە مەرجێك ئەو دوو دەرمانە کارلێك لەگەڵ یەکتردا نەکەن.

هەندێك دەرمان بە تەنها بۆ نەخۆشی بەکاردێت، بەڵام هەندێکی تر لەگەڵ دەرمانێکی تردا پێکەوە بەکاردێن ئەویش ئەگەر ٢ دەرمان بەیەکەوە بەکاربێت لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوەیە:

١-چونکە لەسەر نەخۆش قورسترە ٢ دەرمان بە جیا بەکاربێنێت، بەمەش کاریگەری دەرونی لەسەر نەخۆش دروست ناکات.

گروپی C: موتالەعەکانی ڕووی ئاژەڵی نیشاندەری ئەوەیە کە دەرمان بۆ کۆرپەلە کاریگەری لاوەکی هەیە، بەڵام موتالەعەی تەواوی ڕووی ژنانی سکپڕ لە بەردەستدا نیە، بەم هۆیەوە سودەکانی بەکارهێنانی دەرمان لە ژنانی سکپڕدا لەوانەیە لە بەرامبەر مەترسییەکانی دا زیاتر بێت، یان موتالەعەی ڕووی ئاژەڵەکان یان موتالەعەی تەواوی ڕووی مرۆڤ لە بەردەستدا نییە.

گروپی D: تێبینی لەسەر بوونی مەترسی بۆ کۆرپەلەی مرۆڤ هەیە، لە بەرامبەر سود و نەفعەکانی دەرمان مەترسییە ئەگەرییەکانی ئاشکرا کراوە.

گروپی X: موتالەعەی ڕووی ئاژەڵەکان یان مرۆڤ نیشاندەری دروستبوونی تێکچونەکان و ناتەواوییەکانی کۆرپەلەیە، یان کاریگەرییە لاوەکییەکانی باسکراوە گرنگی دروستبوونی مەترسییەکانی بۆ کۆرپەلەیە، بە سەرنجدان بە بوونی ئەم مەترسیانە بەکارهێنانی لە سکپڕیدا قەدەغەیە.

گروپی NR: ریزبەندی نەکراوە (NO RATED) ئەم گروپە زیاتر دەرمانە زۆر نوێیەکان دەگرێتەوە و هەندێ لە دەرمانە گیاییەکان، گیاکانی دەرمانی و تەواوکەرەکانی دەرمانی دەبێت (ئەم گروپە لە دابەشکردندا بەشێکی گروپەکانی FDA نییە).

**دەرمانە باوەکان:** Common drugs

**ئەی-سی-ئەی: A. C. A**

**ناوی بازرگانی:** Excedrin

**گروپی دەرمانی:** پێکهاتەی ئەسیامینوفین + کافائین + A.S.A

**گروپی چارەسەر:** دژی ئازار، دژی تا.

**شێوەی دەرمان:** حەب.

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا:** گروپی D.

کاریگەری لاوەکی: هێڵنجدان، ڕشانەوە، تێکچونی هەرس، تێکچونی گورچیلە، برینی دەستگای هەرس.

**ئاکاربۆز: ACARBOSE**

**ناوی بازرگانی:** Precose

**گروپی دەرمانی: ڕێگری ئەلفاگلوکۆسیدەیز.**

**گروپی چارەسەر: دژی نەخۆشی شەکرە.**

**شێوەی دەرمان: حەبی ٥٠ و ١٠٠ میلی گرامی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی B.**

کاریگەری لاوەکی: هێڵنجدان، نەمانی ئارەزوی خواردن، خوێنبەربوون، خوران، خراپی ئیشی جگەر، هەوکردنی جگەر، زەردی، ئازاری سك، سکچون، غازات، تێکچونی گورچیلە.

**ئەسیتامینوفین:** ACETAMENOPHEN

**ناوی بازرگانی:** Paracetamole

**گروپی دەرمانی: لێوەرگیراوی پارائەمینۆفینیل.**

**گروپی چارەسەر: دژی ئازاری سڕنەکەر، دژی تا.**

**شێوەی دەرمان: حەب، شروب، شاف، قەترە، ڤیاڵ.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی B.**

کاریگەری لاوەکی: تێکچونی جگەر.

**ئەسیتامینوفین کۆداین: ACETAMENOPHEN CODIENE**

**ناوی بازرگانی:** Tylenol

**گروپی دەرمانی: پێکهاتەی ئەسیتامینوفین + کۆداین.**

**گروپی چارەسەر: دژی ئازار، دژی تا.**

**شێوەی دەرمان: حەب.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی C.**

کاریگەری لاوەکی: تێکچونی جگەر، گێژی، پەڵە، خوران، برینی دەم، سکچون، ڕشانەوە، هێڵنجدان، ئازاری سك، تا، کەمبوونەوەی شەکری خوێن، هەناسە توندی.

**ئەسیتازۆڵەماید: ACETAZOLEAMIDE**

**ناوی بازرگانی:** Diamox, A-KZOL

**گروپی دەرمانی: ڕێگری ئەنزیمی کاربۆنیك ئەنهایدرەیز.**

**گروپی چارەسەر: دژی گلوکۆما (ئاوی ڕەشی چاو)، دژی تەشەنوج، دژی ئۆدیما (کۆبونەوەی ئاو لەلەشدا).**

**شێوەی دەرمان: حەب و ئەمپوڵ، حەبی ٢٥٠ میلی گرەمی، دەرزی ٥٠٠ میلی گرەمی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی C.**

کاریگەری لاوەکی: ژەهراوی بوونی پێست، دروست بوونی بەرد لەگورچیلە، گێژی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچون، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، حەساسیەت، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، زیادبوونی شەکری خوێن.

**ئەسیتایل کولین کلۆراید: ACETYLECHOLINE CHLORIDE**

**ناوی بازرگانی:** Miochol

**گروپی دەرمانی: هاندەری کۆڵینێرجیك.**

**گروپی چارەسەر: تەسککەرەوەی بیلبیلەی چاوە.**

**شێوەی دەرمان: ئەمپوڵ.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی C.**

کاریگەری لاوەکی: خابوونەوەی لێدانی دڵ، تەنگەنەفەسی، سنگەکوژێ، تێکچونی بینین، کەمبوونەوەی پەستانی خوێن، کرژبوونی سك، ئارەقکردن.

**ئەسیتایل سیستین: ACETYLE CYSTEINE**

**ناوی بازرگانی:** Parvolex

**گروپی دەرمانی: پێکهاتەی ئەمینۆ ئەسیدە (ال – سیستئین).**

**گروپی چارەسەر: ئەنتی دۆتی ئەسیتامینۆفین ( دژی ئەسیتامینۆفین و خاڵی کردنەوەی ژەهراویبوون بە ئەسیتامینۆفین).**

**شێوەی دەرمان: حەب و دەرزی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی B.**

کاریگەری لاوەکی: خاولیدانی دڵ، زۆربوونی لیك، هێڵنجدان، ڕشانەوە، خوران، پەڵە، ئیلتیهابی زمان، کرژبوونی بۆری هەوا، تا، بەرزبوونەوەی پەستان، تەشەنوج، نزمبوونەوەی پەستان، سەرگێژبوون، خەواڵویی.

**ئەسیكلۆڤیر: ACICLOVIR**

**ناوی بازرگانی:** Zovirax

**گروپی دەرمانی: نیوكلۆساید پیورین (دەستكرد).**

**گروپی چارەسەر: دژی ڤایرۆس.**

**شێوەی دەرمان: حەب و مەلهەم و دەرزی.**

**بەكارهێنانی لە سكپڕیدا: گروپی C.**

**كاریگەری لاوەكی:** بوونی خوێن لە میزدا، دڵە كوتێ، سەرگێژبوون، لەرزین، سەرئێشە، تەشەنوج، كەمبوونەوەی پەستانی خوێن، سوتانەوەی چاو، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سكچون، كەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، خوران، پەڵە، زیپكە، سوتانەوە، ئیلتیهاب لەشوێنی دەرزی لێدان، ئازاری جومگە، كەمخوێنی، تێكچونی گورچیلە، كەمبوونەوەی خرۆكە سپی یەكانی خوێن.

**ئەسیترێتین: ACITRETIN**

**ناوی بازرگانی:** Soriatane

**گروپی دەرمانی: پێكهاتەی ڕیتینۆئید (ڤیتامین A).**

**گروپی چارەسەر: دژی زیپكە، دژی سۆریاسس.**

**شێوەی دەرمان: كەپسولی ١٠ و ٢٥ میلی گرەمی.**

**بەكارهێنانی لە سكپڕیدا: گروپی X.**

**كاریگەری لاوەكی:** سەرئێشە، خەمۆكی، بێخەوی، كۆبوونەوەی ئاو (ئۆدیما)، هەڵوەرینی موو، پەڵە، هەوكردنی لێو، شەوكوێری، هەوكردنی لوت، هێڵنجدان، سكچون، ئازاری سك.

**ئەسیتایل سالیسیك ئەسید: A.S.A**

**ناوی بازرگانی:** Aspirin

**گروپی دەرمانی: سالیسیلەیت.**

**گروپی چارەسەر: دژی ئازار، دژی تا، دژی ئیلتیهاب، ڕێگرتن لە كەڵەكەبوونی پەڕەكانی خوێن.**

**شێوەی دەرمان: حەب و شاف.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی D.**

کاریگەری لاوەکی: خەوالّویی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرگێژبوون، برینی گەدە، خوێن بەربوونی گەدە، تێکچونی فرمانی جگەر، تێکچونی هەرس، پەڵە، ئارەقکردنەوە.

### ئەدینوساین: ADENOSINE

**ناوی بازرگانی:** Adenocard

**گرووپی دەرمانی: نیوکلوزاید.**

**گرووپی چارەسەر: دژی نارێکی لێدانی دڵ، دەرمانی یارمەتیدەری تەشخیصی.**

**شێوەی دەرمان: دەرزی (ئەمپول).**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی C.**

کاریگەری لاوەکی: سەرگێژبوون، تێکچونی بینین، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ئازاری مل، ئازاری قەفەسەی سنگ، تەنگەنەفەسی، سەرئێشە.

### ئەدالت کۆڵد: ADULT COLD

**ناوی بازرگانی:** Corisan

**گرووپی دەرمانی: پێکهاتەی ئەسیتامینوفین + کلۆرفینرامین + فینیل ئافرین.**

**گرووپی چارەسەر: دژی سەرماخوردەگی.**

**شێوەی دەرمان: حەب.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی C یان B.**

کاریگەری لاوەکی: سەرگێژبوون، خەوالّویی، وشکبوونەوەی دەم، تێکچونی بینین، تێکچونی دەزگای هەناسەدان.

### ئەلبیندازۆڵ: ALBENDAZOLE

**ناوی بازرگانی:** Albenza

**گرووپی دەرمانی: پێکهاتەی بینزیمیدازۆڵ.**

**گرووپی چارەسەر: دژی کرمە پانەکان.**

**شێوەی دەرمان: حەب و شروب.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی C.**

کاریگەری لاوەکی: سەرئێشە، سەرگێژبوون، تا، پەڵە، هەڵوەرینی موو، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، حەساسیەت، نیشانەکانی هەوکردنی پەردەی مێشك، شەرا.

**ئەلبۆمینی ئینسانی: ALBUMIN HUMAN**

**ناوی بازرگانی:** Albuminar

**گروپی دەرمانی:** وەرگیراوەکانی خوێن.

**گروپی چارەسەر:** زیادکەرەوەی قەبارەی پلاما.

**شێوەی دەرمان:** دەرزی.

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا:** گروپی C.

کاریگەری لاوەکی: هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچون، زۆرلێدانی دڵ سەرئێشە، پەڵە، بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، کەمخوێنی، کۆبوونەوەی ئاو لە سی یەکاندا، تا، لەرز، ئازاری پشت.

**ئەلیندرۆنەیت: ALENDRONATE**

**ناوی بازرگانی:** Fosamax

**گروپی دەرمانی:** ڕێگری مژینەوەی خانەکانی ئێسك بە بلۆککردنی چالاکی ئۆستیۆکلاست.

**گروپی چارەسەر:** دژی پوکانەوەی ئێسك.

**شێوەی دەرمان:** حەب.

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا:** گروپی C.

کایگەری یە لاوەکی: سەرئێشە، هێڵنجدان، قەبزی، ئازاری سك، غازات، برینی قوڕگ، خوران، پەڵە، ئازاری قەفەسەی سنگ، ئۆدیما(کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا)، تێکچونی گەدە، ئازاری ماسولکە، سوربونەوە، ئازاری کەمەر.

**ئەلۆپرینۆڵ: ALLOPURINOL**

**ناوی بازرگانی:** Lopurin

**گروپی دەرمانی:** ڕێگری ئەنزیمی گزانتین ئۆکسیدەیز.

**گروپی چارەسەر:** دژی نەخۆشی پاشاکان.

**شێوەی دەرمان:** حەبی ١٠٠ و ٣٠٠ میلی گرەمی.

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی C.**

کاریگەری لاوەکی: سەرئێشە، بێخەوی، ئاوی سپی، خوێنبەربوونی لوت، هەڵوەرینی موو، خوران، هەوکردنی پێست، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچون، ئازاری سك، تێکچونی هەرس، تێکچونی گورچیلە، هەوکردنی جگەر، تا، کەمخوێنی.

## ئەلپرازۆلام: ALLPRAZOLAM

**ناوی بازرگانی:** Xanax

**گرووپی دەرمانی: بێنزۆدیازیپینەکان.**

**گرووپی چارەسەر: دژی دڵەڕاوکێ، خەوهێنەرە.**

**شێوەی دەرمان: حەبی ٠,٥ و ١ میلی گرەمی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی D.**

کاریگەری لاوەکی: سەرئێشە، سەرگێژبوون، لەرزین، تێکچونی هاوسەنگی، بێهۆشی، تەنگەنەفەسی، تێکچونی بینین، کەمبوونەوەی پەستانی خوێن، زیادبوونی لێدانی دڵ بێهێزی، ناجێگیری، گۆڕانی ECG، خەوالّویی، خەیاڵ

## ئەلەمنیۆم هایدرۆکساید: ALUMINIUM HYDROXIDE

**ناوی بازرگانی:** Alegel

**گرووپی دەرمانی: خوێی ئەلەمنیۆم.**

**گرووپی چارەسەر: دژی ترشەڵۆك (ئەنتی ئەسید).**

**شێوەی دەرمان: حەب و شروب.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی C.**

کاریگەری لاوەکی: قەبزی، کەمبوونەوەی فۆسفات، نەمانی ئارەزوی خواردن، ژەهراوی بوون بە ئەلەمنیۆم، بێهێزی ماسولکەیی.

## ئەلەمنیۆم ئێم جی: ALUMINIUM Mg

**ناوی بازرگانی:** Almox

**گرووپی دەرمانی: ئەنتی ئەسید (دژی ترشۆڵوك).**

**گرووپی چارەسەر: ئەنتی ئەسید.**

**شێوەی دەرمان: حەب و شروب.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی C.**

کاریگەری لاوەکی: سکچوون، قەبزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، کرژبوونی گەدە، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، کەمبوونەوەی جوڵەی ڕیخۆڵە، سپی بوونەوەی پیسایی.

**ئەلەمنیۆم ئێم جی ئێس: ALUMINIUM Mg S**

**ناوی بازرگانی:** Magel

**گرووپی دەرمانی: ئەنتی ئەسید (دژی ترشۆڵوك).**

**گرووپی چارەسەر: دژی غازات.**

**شێوەی دەرمان: حەب و شروب.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی D.**

کاریگەری لاوەکی: هێڵنجدان، قەبزی، پەڵە، خوران، ئاوسان، ڕشانەوە، سکچوون، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن.

**ئەمانتادین: AMANTADINE HCL**

**ناوی بازرگانی:** Symmetrel

**گرووپی دەرمانی: ئەمینە حەڵقەییەکان.**

**گرووپی چارەسەر: دژی ڤایرۆس، دژی پارکینسۆن (لەرزینی خۆنەویستی ئەندامەکان).**

**شێوەی دەرمان: کەپسولی ١٠٠ میلی گرەمی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی D.**

کاریگەری لاوەکی:بێخەوی، بێهێزی، خەمۆکی، کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا، سەرگێژبوون، وشکبوونەوەی دەم، زۆر میزکردن، ناجێگیری، خەواڵویی، نزمبوونەوەی پەستان، تێکچونی بینین، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، پەڵە، ئەکزیما(بیرۆ)، هەستیاربوونی بە ڕووناکی، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، تەنگەنەفەسی.

**ئەمیکاسین: AMIKACIN SULFATE**

**ناوی بازرگانی:** Amikin

**گرووپی دەرمانی: ئەمینۆگلایکۆسایدەکان.**

**گرووپی چارەسەر: ئەنتی بایۆتیك (دژە زیندەگی).**

**شێوەی دەرمان: ئەمپولی ١٠٠ و ٥٠٠ میلی گرەمی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی D.**

کاریگـەری لاوەکـی: سـەرئێـشە، بێهێـزی، بێحـاڵی، سکـچون، کەمبوونـەوەی بیـستن، حەساسیەت، سەرگێژبوون، ناتەواوی گورچیلە.

**ئەمیلۆراید: AMILORIDE-H**

**ناوی بازرگانی:** Moduretic

**گرووپی دەرمانی: میزپێکەرەکان.**

**گرووپی چارەسەر: دژی پەستانی خوێن.**

**شێوەی دەرمان: حەب.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی B.**

کاریگەری لاوەکی: سەرگێژبوون، سەرئێشە، غازات، بێهێزی، خەواڵویی، نزمبوونەوەی پەسـتانی خـوێن، نـاڕێکی لێـدانی دڵ زۆر میزکـردن، کەمبوونـەوەی ئـارەزوی سێکـسی، هێڵنجـدان، ڕشـانەوە، خـوران، قـەبزی، ئـازاری سـك، خوێنبـەربوونی GI، کـەمخوێنی، کەمبوونەوەی خرۆکە سـپی یـەکانی خـوێن، کەمبوونـەوەی صـۆدیۆم و کلـۆر، زیـادبوونی پۆتاسیۆم، کرژبوونی ماسولکە، ئازاری پشت، ئازاری قەفەسەی سنگ، بلـۆقکردنی پێـست، گێژی، خەمۆکی.

**ئەمینۆ کاپرۆیك ئەسید: AMINOCAPROIC ACID**

**ناوی بازرگانی:** Amicar

**گرووپی دەرمانی: گرووپی کاربۆکسیلیك ئەسید.**

**گرووپی چارەسەر: ڕێگری فایبرینۆ لایزیس (دژی خوێنبەربوون).**

**شێوەی دەرمان: ئەمپول.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی C.**

کاریگـەری لاوەکـی:سـەرگێژبوون، سەرئێـشە، هێڵنجـدان، ئـازار و کرژبـوونی سـك، سکچون، تەشەنوج، خەیاڵ بێهێزی، بێحاڵی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، نـاڕێکی لێـدانی دڵ کەمبوونەوەی لێدانی دڵ گیرانی لوت، ناتەواوی گورچیلە.

**ئەمینۆ ئەسید: AMINO ACID**

**شێوەی دەرمان: ئەمپولی ١٠٠ و ٥٠٠ میلی گرەمی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی D.**

کاریگـەری لاوەکـی: سـەرئێـشە، بێهێـزی، بێحـاڵی، سکـچون، کەمبوونـەوەی بیـستن، حەساسیەت، سەرگێژبوون، ناتەواوی گورچیلە.

**ئەمیلۆراید: AMILORIDE-H**

**ناوی بازرگانی:** Moduretic

**گروپی دەرمانی: میزپێکەرەکان.**

**گروپی چارەسەر: دژی پەستانی خوێن.**

**شێوەی دەرمان: حەب.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی B.**

کاریگەری لاوەکی: سەرگێژبوون، سەرئێشە، غازات، بێهێزی، خەواڵویی، نزمبوونەوەی پەستانی خـوێن، نـارێکی لێـدانی دڵ، زۆر میزکـردن، کەمبوونـەوەی ئـارەزوی سێکـسی، هێڵنجـدان، ڕشـانەوە، خـوران، قـەبزی، ئـازاری سـك، خوێنبـەربوونی GI، کـەمخوێنی، کەمبوونەوەی خڕۆکە سـپی یـەکانی خـوێن، کەمبوونـەوەی صـۆدیۆم و کلـۆر، زیـادبوونی پۆتاسیۆم، کرژبوونی ماسولکە، ئازاری پشت، ئازاری قەفەسەی سنگ، بلـۆقکردنی پێـست، گێژی، خەمۆکی.

**ئەمینۆ کاپرۆیك ئەسید: AMINOCAPROIC ACID**

**ناوی بازرگانی:** Amicar

**گروپی دەرمانی: گروپی کاربۆکسیلیك ئەسید.**

**گروپی چارەسەر: ڕێگری فایبرینۆ لایزیس (دژی خوێنبەربوون).**

**شێوەی دەرمان: ئەمپوڵ.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی C.**

کاریگـەری لاوەکـی:سـەرگێژبوون، سەرئێـشە، هێڵنجـدان، ئـازار و کرژبـوونی سـك، سکچون، تەشەنوج، خەیاڵ بێهێزی، بێحاڵی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، نـارێکی لێـدانی دڵ، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، گیرانی لوت، ناتەواوی گورچیلە.

**ئەمینۆ ئەسید: AMINO ACID**

**گروپی دەرمانی: ئەمینۆ ئەسیدەکان.**

**گروپی چارەسەر: خۆراك پێدەری ناوەوەی خوێنهێنەر و پرکالۆری.**

**شێوەی دەرمان: دەرزی ٥٪ و ١٠٪ ١ لیتری.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی C.**

کاریگەری لاوەکی: کەمبوونەوەی هۆشیاری، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، سەرئێشە، هێڵنجدان، سەرگێژبوون، کۆبوونەوەی ئاو لە سی یەکاندا، ئازاری ماسولکەیی، نەمانی هاوسەنگی ئەلیکترلیتەکان، ڕشانەوە، زیادبوونی ئەنزیمەکانی جگەر، کەمبوونەوەی کالسیۆم، زیادبوونی شەکری خوێن، کەمبوونەوەی فۆسفات.

## ئەمینۆ گلوتیتیمایدː AMINOGLUTETHIMIDE

**ناوی بازرگانی:** Cytadren

**گروپی دەرمانی: هۆرمۆنەکان.**

**گروپی چارەسەر: دژی شێرپەنجە (دژی ڕژێنی ئەدرینالْ).**

**شیوەی دەرمان: حەبی ٢٥٠ میلی گرامی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی D.**

کاریگەری لاوەکی: سەرئێشە، سەرگێژبوون، خەوالّویی، زیادبوونی لێدانی دلْ زیادبوونی پەستانی خوێن، خوران، پەڵە، گێژی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، تا، ناتەواوی ئەدرینالْ، زۆربوونی موو، زیادبوونی پایرۆید، ئازاری ماسولکە.

## ئەمینۆفیلینː AMINOPHYLINE

**ناوی بازرگانی:** Amoline

**گروپی دەرمانی: وەرگیراوی گزانتین.**

**گروپی چارەسەر: فراوانکەرەوەی سی (بۆریچکەکان)، دژی ڕەبۆ.**

**شیوەی دەرمان: بەشێوەی دەرزی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی C.**

کاریگـەری لاوەکـی: هێڵنجـدان، تەشـەنوج، ڕشـانەوە، گێـژبوون، خێـرا لێـدانی دڵ ناجێگیری، سەرئێشە، بێخەوی، تا، سکچون، ناڕێکی لێدانی دڵ کەمبوونـەوەی ئـارەزوی خواردن، زیادبوونی شەکری خوێن، ڕوشانی مەوزوعی، دابەزینی توندی پەستانی خوێن.

**ئەمایۆدارۆن: AMIODARONE HCL**

**ناوی بازرگانی:** Cordarone

**گروپی دەرمانی: بێنزۆفیوران.**

**گروپی چارەسەر: دژی ناڕێکی سکۆڵەیی یان گوێچکەڵەی (دڵ).**

**شیوەی دەرمان: حەب و ئەمپوڵ ( ٢٠٠ و ١٥٠ میلی گرەمی).**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی** C.

کاریگەری لاوەکی: کەمبوونەوەی فۆلیك ئەسید، تێکچونی جگەر، بێهێزی، هیلاکبـوون، ڕشانەوە، وشکبوونەوەی چاو، سەرئێـشە، کەمبوونـەوەی لێـدانی دڵ نـاڕێکی لێـدانی دڵ نزمبوونەوەی پەستان، تێکـچونی بیـنین، هەسـتیاربوون بـەڕوناکی، زیـادبوون و کـەمبوونی پایرۆید، هێڵنجدان، تێکچونی زیندە چالاکیی، تێکچونی سی یەکان.

**ئەمیتریپتیلین: AMITRIPTYLIN HCL**

**ناوی بازرگانی:** Amitril

**گروپی دەرمانی: دژی خەمۆکی (سێ ئەلقەیی).**

**گروپی چارەسەر: دژی خەمۆکی و (ئەعصابی دەرونی).**

**شیوەی دەرمان: حەبەکانی ١٠ و ٢٥ و ١٠٠ میلی گرەمی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی** D.

کاریگـەری لاوەکـی: خـەواڵویی، سـەرگێژبوون، سەرئێـشە، هیلاکبـوون، تەشـەنوج، دڵەڕاوکێ، گێژی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، سکچون، ڕشانەوە، شـۆك، بەرزبوونەوەی پەستان، گۆڕانی ECG، کەمبوونەوەی نارەزوی خواردن، کرژبوونی سـك، وشـــکبوونەوەی دەم، تێکـــچونی بیـــنین، وشـــکبوونەوەی چـــاو، گـــەورەبوونی چـــاو، ئارەقکردنەوە، زیادبوونی هەستیاری، هەستیاربوون بەڕوناکی.

**ئەمیلۆدیپین: AMLODIPINE**

**ناوی بازرگانی:** Norvasc

**گروپی دەرمانی: بلۆککەرەکانی کانالّی کالسیۆم.**

**گروپی چارەسەر: دژی پەستانی خوێن.**

**شیوەی دەرمان:حەبی ٥ میلی گرەمی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی C.**

کاریگـەری لاوەکـی:سـوربونەوە، زۆرلـێـدانی دڵ سـك ئێـشە، هێڵنجـدان، سەرئێـشە، کۆبوونەوەی ئاو لـەلـەشدا، ئازاری سنگ، بێهێـزی، سـەرگێژبوون، هیلاکبـوون، بێخـەوی، نارێکی لێدانی دڵ خوران، ئازاری چاو، پەڵە، ئازاری ماسولکەیی، تەنگەنەفەسـی، ئـازاری قەفەسەی سنگ.

**ئەمۆنیۆم کلۆراید:AMMONIUM CHLORIDE**

**ناوی بازرگانی:** Ammorchlor

**گروپی دەرمانی: یەك جۆر خوێی ترشکەرە.**

**گروپی چارەسەر: بەڵغەم هێنەرە و ترشکەری میز.**

**شیوەی دەرمان:حەبی ٥٠٠ میلی گرەمی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی B.**

کاریگەری لاوەکی:هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکـچون، کەمبوونـەوەی صـۆدیۆم، پەڵـە، سەرئێـــشە، خـــەواڵوی، خرۆشـــان، تێکـــچونی ECG، کەمبوونـــەوەی لێـــدانی دڵ زۆرمیزکردن، وەستانی هەناسە، کەمبوونـەوەی پۆتاسـیۆم، زیـادبوونی کلـۆر، زیـادبوونی شەکری خوێن.

**ئەمۆکسیسیلین: AMOXICILLIN**

**ناوی بازرگانی:** Amoxil

**گروپی دەرمانی: ئەنتی بایۆتیك (پەنسیلینەکان).**

**گروپی چارەسەر: دژەزیندەگی،**

**شیوەی دەرمان:کەپسول، حەب، شروب.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی B.**

کاریگەری لاوەکی: هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچون، پەڵە، کەمخوێنی، تێکچونی گەدە، دڵەڕاوکێ، گێژی، خەمۆکی، تەشەنوج، هیلاکبوون، هەوکردنی دەزگای زایەندی ژنان، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، زیادبوونی حەساسیەت.

**ئەمفۆ تریسین – بی: AMPHOTERICIN – B**

**ناوی بازرگانی:** Fungizone

**گروپی دەرمانی: دژی کەڕوو (ماکرۆلیدەکان).**

**گروپی چارەسەر: دژی کەڕوو و هەوکردن.**

**شێوەی دەرمان: بەشێوەی دەرزی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی B.**

کاریگەری لاوەکی: هێڵنجدان، ڕشانەوە، تا، سك ئێشە، سەرئێشە، تەشەنوج، ناڕێکی لێدانی دڵ نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، کەمبوونەوەی کێش، سکچون، کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم و مەگنسیۆم، کەمخوێنی، تێکچونی هەرس.

**ئەمپی سیلین: AMPICILIN**

**ناوی بازرگانی:**Amcill

**گروپی دەرمانی: پەنسیلینەکان (ئەمینۆ پەنسیلینەکان).**

**گروپی چارەسەر: دژە زیندەگی (ئەنتی بایۆتیك).**

**شێوەی دەرمان:کەپسول و شروب و ئەمپول.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی B.**

کاریگەری لاوەکی: هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچون، کەمخوێنی، ئازاری سك، نەمانی ئارەزوی خواردن، تەشەنوج، تا، برینی گەروو، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن.

**ئەمایل نایترەیت: AMYL NITRITE**

**گروپی دەرمانی: نایترەیتەکان.**

**گروپی چارەسەر: دژی ژەهراویبوون بە سیانیدەکان و فراوانکەری مولولەی خوێنە.**

**شێوەی دەرمان: ئەمپول بۆ ئیستینشاقی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی C.**

کاریگەری لاوەکی: سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێهێزی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، زیادبوونی لێدانی دڵ، فراوانکردنی مولولەکانی پێستی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سوربونەوە.

**ئەنثوسیانۆزید A: ANTHOCYANOSIDE A**

**ناوی بازرگانی:** Difrarel E

**گرووپی دەرمانی: ئەنثوسیانۆزید.**

**گرووپی چارەسەر: چارەسەری تێکچونەکانی مولولەکان.**

**شیوەی دەرمان: حەب.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: ڕێگە پێدراوە.**

**ئەنتی هەموفیلیك: ANTIHEHEMOPHILIC FACTOR**

**ناوی بازرگانی:** Factorate

**گرووپی دەرمانی: وەرگیراوەکانی خوێن.**

**گرووپی چارەسەر: دژی هیمۆفیلیا A (خوێنبەربوونی بۆماوەیی) (فاکتەری ژمارە ٨).**

**شیوەی دەرمان: بەشێوەی دەرزی (ڤیاڵ).**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی C.**

کاریگەری لاوەکی: سەرئێشە، سوربونەوە، سەرگێژبوون، هیلاکبوون، زیادبوونی لێدانی دڵ نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، ئازاری پشت، ڕشانەوە، تێکچونی پێست، ئازاری قەفەسەی سنگ، تێکچونی هۆشیاری، کرژبوونی بۆری هەوا، کۆکە، تا، لەرز.

**ئە پومورفین: APOMORPHINE HCL**

**ناوی بازرگانی:** Apomorphin Hcl

**گرووپی دەرمانی: ئەلکالۆید.**

**گرووپی چارەسەر: ڕشانەوەهێنەر.**

**شیوەی دەرمان: بەشێوەی دەرزی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی C.**

کاریگــەری لاوەکــی: خــەوئالودەبوون، گێــژی، نــاجێگیری، کــەمبوونی لێــدانی دڵ زیادبوونی لێدانی دڵ کەمبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجـدان، ڕشـانەوە، ئـارەقکردن، زیادبوونی لیك.

**ئەپرۆتینین: APROTININ**

**ناوی بازرگانی:** Trasylol

**گروپی دەرمانی: ڕێگری ئەنزیمی پرۆتۆلیتیك.**

**گروپی چارەسەر:دژی خوێنبەربوون.**

**شیوەی دەرمان:بەشێوەی دەرزی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی B.**

کاریگەری لاوەکی: ناتـەواوی دڵ ڕەبـۆ، تێکـچونی گورچـیلە، زیـادبوونی لێـدانی دڵ زیادبوونی حەساسیەت، کۆبوونەوەی ئاو لـە سی یەکانـدا، تەنگەنەفەسـی، هـەوکردنی سـی یەکان، تێکچونی هەناسـە.

**ئارتی فیشیال تیرز: ARTIFICIALTEARS**

**ناوی بازرگانی:** Adapettes

**گروپی دەرمانی: پێکهاتەی پۆلیڤینیل ئەلکهول و سلیلۆز.**

**گروپی چارەسەر: فرمێسکی دەستکرد.**

**شیوەی دەرمان:بەشێوەی قەترە.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی C.**

کاریگەری لاوەکی:ڕوشانی چاو، تێکچونی بینین.

**ئەسپاراجینەیز: ASPARAGINASE**

**ناوی بازرگانی:** Elspar

**گروپی دەرمانی: ئەنزیم.**

**گروپی چارەسەر: دژی شێرپەنجە(نیۆپلازم (لوو)).**

**شیوەی دەرمان:بەشێوەی دەرزی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی C.**

کاریگـەری لاوەکـی:خـەوالّویی، تـا، لـەرز، ئـازاری سـك، خرۆشـان، سـەرگێژبوون، سـەرئێشە، تەشەنوج، خەمۆکی، بێهۆشـی، هێڵنجـدان، ڕشـانەوە، حەساسـیەت، ڤێ، شـەرا، نەمانی ئارەزوی خواردن، هەوکردنی پەنکریاس، تێکچونی گورچیلە، کەمبوونەوەی خرۆکـە سپی یەکان.

**ئەتینولول:** ATENOLOL

**ناوی بازرگانی:** Tenormin

**گروپی دەرمانی: بلۆککەری بێتا.**

**گروپی چارەسەر: دژی ئازاری سنگ.**

**شیوەی دەرمان:حەبی ٥٠ و ١٠٠ میلی گرەمی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی** C.

کاریگەری لاوەکی:هیلاکبوون، خەمۆکی، تێکچونی هەرس، لاوزبوونی توانای سێکسی، تەسکبوونەوەی بۆری هە وا، سکچون، سەرگێژبوون، لاوازبوونی دڵ کەمبوونەوەی لێـدانی دڵ خەوالّویی، کەمبوونی شەکری خوێن، پەڵە، تێکـچونی بیـنین، تـا، زیـادبوونی شـەکری خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، وشکبوونەوەی چاو، بێهێزی.

**ئەتۆرڤاستاتین: ATORVASTATIN**

**ناوی بازرگانی:** Lipitor

**گروپی دەرمانی: ڕێگری ٣ هایدرۆکسی ٣ مەثیل گلوتاریل کۆئەنزیمA .**

**گروپـی چارەسـەر: دژی چـەوری خـوێن (کەمکردنـەوەی LDL و کۆلیـسترۆڵی تەواو).**

**شیوەی دەرمان:حەبی ١٠ و ٢٠ و ٤٠ میلی گرەمی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی** X.

کاریگـەری لاوەکـی:بێخـەوی، ئـازاری سـنگ، ئـازاری ماسـولکە و جومگـە، ئۆدیمـا، تێکچونی گەدە، ئازاری سك، هێڵنجدان، سکچون، غازات، سەرئێـشە، تێکـچونی جگـەر، پەڵە، حەساسیەت، هەوکردن، ئازاری کەمەر، هەوکردنی گەروو، جیوب.

**ئەتراکیوریوم: ATRACURIUM**

**ناوی بازرگانی:** Tracrium

**گروپی دەرمانی: رێگری دەماری – ماسولکەیی.**

**گروپی چارەسەر: شلکەرەوەی پەیکەرە ماسولکە.**

**شێوەی دەرمان: بەشێوەی دەرزی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: ڕێزبەندی نەکراوە.**

کاریگەری لاوەکی: کەمبوونەوەی پەستانی خوێن، زیادلێدانی دڵ، کرژبوونی بۆری هەوا، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ سوربونەوە، خوران، تەنگەنەفەسی، زیادبوونی گەرمی لەش، پەڵە، کەمبوونەوەی صۆدیۆم، وەستانی هەناسە.

**ئەتروپین سەلفەیت: ATROPINE SULFATE OPH.**

**ناوی بازرگانی:** Actonorm

**گروپی دەرمانی: گروپی ئەنتی کۆلینێرجیکەکان.**

**گروپی چارەسەر: فراوانکەرەوەی بیلبیلەی چاو.**

**شێوەی دەرمان: قەترە و مەڵهەمی چاو.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی C.**

کاریگەری لاوەکی: وشکبوونی دەم، تێکچوونی بینین، کەمبوونەوەی هەموو دەردراوەکان، زیادبوونی پەستانی ناو چاو، ڕوشانی پێست، کۆبوونەوەی ئاو لەلەشدا، سوتانەوە، زیادبوونی لێدانی دڵ سەرئێشە، خەواڵویی، پەڵەی پێست، تا، بێهۆشی.

**ئەتروپین سەلفەیت: ATROPINE SULFATE SYS.**

**ناوی بازرگانی:** Atropisol

**گروپی دەرمانی: ئەنتی کۆلینێرجیکەکان.**

**گروپی چارەسەر: دژی کەمبوونی لێدانی دڵ (برادیکاردیا) و ناڕێکی لێدانی دڵ و دژی ژەهراویبوون، مادەی ژەهری ئۆرگانۆفۆسفەیتەکان (مێرووکوژەکان).**

**شێوەی دەرمان: حەب و ئەمپول.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی C.**

کاریگەری لاوەکی: وشکبوونی دەم، تێکچوونی بینین، کەمبوونەوەی هەموو دەردراوەکان، سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێخەوی، خرۆشان، گێژی، زیادبوونی لێدانی دڵ سوربونەوە، قەبزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، گەورەبوونی چاو.

**ئەستیمیزۆڵ: ASTEMIZOLE**

**ناوی بازرگانی:** Hismanal

**گروپی دەرمانی: ئەنتی هیستامین.**

**گروپی چارەسەر: دژە حەساسیەتە خەونەهێنەرەکان.**

**شێوەی دەرمان:حەبی ٥٠ میلی گرامی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: ڕیزبەندی نەکراوە.**

کاریگەری لاوەکی:سەرگێژبوون، سەرئێشە، ناجێگیری، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، ئازاری جومگە.

**ئەزاثیوثرین: AZATHIOPRINE**

**ناوی بازرگانی:** Imuran

**گروپی دەرمانی: ڕێگری زیندەچالاکی پیورین.**

**گروپی چارەسەر: کپکەرەوەی بەرگری، دژی ڕۆماتیزم.**

**شیوەی دەرمان:حەب و کەپسولی ٥٠ و ٢٥٠ میلی گرەمی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی** D.

کاریگەری لاوەکی:ئازاری ماسولکە، ڕشانەوە، تێکچونی پێست، کەخوێنی، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، تێکچونی جگەر، تێکچونی مۆخی ئێسك، پەڵە، هێڵنجدان، نەمانی ئارەزوی خواردن، ئیلتیهابی قورگ، هەڵوەرینی موو، تا، خوران، ئازاری جومگە.

**باسیتراسین: BACETRACIN**

**ناوی بازرگانی:** AK- Tracin

**گروپی دەرمانی: ئەنتی بایۆتیك پۆلی پێپتاید.**

**گروپی چارەسەر: دژە زیندەگی (ئەنتی بایۆتیك).**

**شێوەی دەرمانی: مەڵهەمی چاوی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی** C.

کاریگەری لاوەکی: سوتانەوە، خوران، ئیلتیهاب، حەساسیەت، ڕوشان.

**باكلۆفین: BACLOFEN**

**ناوی بازرگانی:** Lioresal

**گروپی دەرمانی: وەرگیراوی كلۆرۆفینیل.**

**گروپی چارەسەر: شل كەرەوەی پەیكەرە ماسولكە.**

**شێوەی دەرمانی: حەبی ١٠ و ٢٥ میلی گرەمی.**

**بەكارهێنانی لە سكپڕیدا: گروپیC.**

كاریگەری یە لاوەكیەكان: سەرگێژبوون، هێڵنجدان، سەرئێشە، نەمانی هاوسەنگی، گێژی، خەواڵویی، ئازاری قەفەسەی سنگ، تێكچونی بینین، گەورەبونی چاو، ڕشانەوە، سكچون، ئازاری سك، نزمبونەوەی پەستانی خوێن، خەوزڕان، پەڵە، قەبزی، شەو میزكردن، زیادبونی كێش، ئازاری ماسولكە، خوران.

**بالانست سالت: BALANCED SALT**

**ناوی بازرگانی:** B.S.S

**گروپی دەرمانی: ئەلیكترۆلیت.**

**گروپی چارەسەر: گیراوەی شۆردنەوەی چاو.**

**شێوەی دەرمانی: گیراوەی چاوی.**

**بەكارهێنانی لە سكپڕیدا: ڕیزبەندی نەكراوە.**

كاریگەری لاوەكی: ئیلتیهاب، برینی كۆرنیە، ئاوبەندی كۆرنیە.

**بالانست سالت لەگەڵ گولوتاتیۆن: BALANCED -PLUS-GLUTATIONE SALT**

**ناوی بازرگانی:** B.S.S PLUS

**گروپی دەرمانی: ئەلیكترۆلیت.**

**گروپی چارەسەر: گیراوەی شۆردنەوەی ناوەوەی چاوی.**

**شێوەی دەرمانی: گیراوە.**

بەكارهێنانی لە سكپڕیدا: ڕیزبەندی نەكراوە.

كاریگەری لاوەكی: ئیلتیهاب، برینی كۆرنیە، ئاوبەندی كۆرنیە.

**باریۆم سەلفەیت: BARIUM SULFATE**

**ناوی بازرگانی:** Baricon

**گروپی دەرمانی: مادەی حاجب.**

**گروپی چارەسەر: مادەی تەشخیصی لە تێکچوونەکانی دەزگای هەرس.**

**شێوەی دەرمانی: پاودەری لایەنی دروستکردنی گیراوەی خۆراکی یان لە ڕیگەی کۆمەوە.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی** D.

کاریگەری لاوەکی: سکچون، حەساسیەت، قەبزی، هەوکردنی ڕیخۆڵەکوێرە، هێڵنجدان.

**بی-سی-جی ئینترافیسیکاڵ: BCG INTRAVESICAL**

**ناوی بازرگانی:** Theracys

**گروپی دەرمانی: ڤاکسین.**

**گروپی چارەسەر:دژی نیۆپلازم (لوو).**

**شێوەی دەرمانی: گیراوە (ڤیاڵ).**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی**C.

کاریگەری لاوەکی:سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێحاڵی، کەمخوێنی، قەبزی، ئازاری سک، نەمانی ئارەزوی خواردن، تا، کۆکە، بوونی خوێن لەمیزدا.

**بی سی جی ڤاکسین: B.C.G VACCINE**

**ناوی بازرگانی:** Tice BCG

**گروپی دەرمانی: ڤاکسین.**

**گروپی چارەسەر: ڤاکسینی دژی مایکۆبەکتریاڵ (نەخۆشی سیل).**

**شێوەی دەرمانی: پاودەر بۆ دەرزی لێدان.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی** C.

کاریگەری لاوەکی: سەرسوڕان، سەرئێشە، تا، هێڵنجدان، ڕشانەوە، کۆکە، حەساسیەتی پێست.

**بی کۆمپلێکس: B-COMPLEX**

**ناوی بازرگانی:** Becotal

**گروپی دەرمانی: ڤیتامینەکان.**

**گروپی چارەسەر:بی کۆمپلێکس.**

**شێوەی دەرمانی: حەب، دەرزی، شروب.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپیA.**

کاریگەری لاوەکی: خوران، سوربونەوەی پێست، هەڵئاوسانی سیەکان، برینی گەدە، زەردوویی، شینبوونەوە بەهۆی کەمی ئۆکسجین، وشکبوونی پێست، بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، ئارەقکردنەوە.

**بیکلۆمیثازۆن: BECLOMETHAZSONE**

**ناوی بازرگانی:** Beclovent

**گروپی دەرمانی: کۆرتۆن (گلوکۆکۆرتیکوید).**

**گروپی چارەسەر: دژی ئیلتیهاب، دژی ڕەبۆ.**

**شێوەی دەرمانی: سپرای دەمی، لوتی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی C.**

کاریگەری لاوەکی: وشکبوونەوەی دەم، پەڵە، سەرئێشە، خوێنبەربوونی لوت، هێڵنجدان، ڕشانەوە، کزانەوەی لوت، کەمبوونەوەی هەستی تامکردن، ئاوکردنی چاو، ئیلتیهابی گەروو.

**بیلادۆنا – پی بی: BELLADONA P.B**

**ناوی بازرگانی:** Barbidona

**گروپی دەرمانی: پێکهاتەی ئەلکالۆید بیلادۆنا.**

**گروپی چارەسەر: دژی ئازار، دژی مەسکارین.**

**شێوەی دەرمانی: حەب و شروب.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی D.**

کاریگەری لاوەکی: سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێخەوی، خەواڵویی، بێهێزی، زیاد لێدانی دڵ نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، گەورەبوونی سك، دڵەکزە، زیادبوونی پەستانی ناوەوەی چاو، گەورەبوونی چاو، گیرانی میز، توڕەیی، قوتدانی بەئازار، خرۆشان، کەمبوونەوەی ئارەقکردن، تا، حەساسیەت.

**بیلادۆنا ئێرگۆتامین- پی بی: BELADONA ERGOTAMINE P.B**

**ناوی بازرگانی:** Bellergal

**گروپی دەرمانی:** ئەلکالۆید بیلادۆنا.

**گروپی چارەسەر:** پێشگرتن لە سەرئێشەکانی شەقیقەیی.

**شێوەی دەرمانی:** حەب.

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا:** گروپی D.

کاریگەری لاوەکی: سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێخەوی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، خەوالّویی، بێهێزی، زیادلێدانی دڵ، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، قەبزی، گەورەبوونی سك، دڵەکزە، زیادبوونی پەستانی ناوەوەی چاو، گەورەبوونی چاو، خرۆشان، کەمبوونەوەی ئارەقکردن، تا، حەساسیەت.

**بێنزۆکاین: BENZOCAINE**

**ناوی بازرگانی:** Oragel

**گروپی دەرمانی:** وەرگیراوی ئەسید، بێهۆشکەری ئەستەری.

**گروپی چارەسەر:** مەوزوعی.

**شێوەی دەرمانی:** مەڵهەمی مەوزوعی.

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا:** گروپی C.

کاریگەری لاوەکی:خوران، ناوسانی مەوزوعی، سەرئێشە، سەرگێژبوون، سوتانەوە، هەستیاربوون بە تیشك، نەمانی نارەزوی خواردن.

**بێنزۆیل پیرۆکساید: BENZOYL PEROXIDE**

**ناوی بازرگانی:** Benzac

**گروپی دەرمانی:** کیراتۆلایتیك.

**گروپی چارەسەر:** دژی زیپکە.

**شێوەی دەرمانی:** جێڵ، لۆشن، صابون.

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا:** گروپی C.

کاریگەری لاوەکی: وشکبوونەوەی پێست، سوتانەوە، ڕوشانی پێست، توێك هەڵدانی پێست، بلۆقکردنی پێست، هەوکردنی پێست، حەساسیەتی پێست.

**بینزۆترۆپین مەسیلات: BENZOTROPIN MESYLATE**

**ناوی بازرگانی:** Akitan

**گروپی دەرمانی: ئەنتی کۆلینێرجیك.**

**گروپی چارەسەر: دژی پارکینسۆن (لەرزینی خۆنەویستی ئەندامەکان).**

**شێوەی دەرمانی: حەب و ئەمپولی ( ٢ میلی گرەمی).**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی** C.

کاریگەری لاوەکی: هێڵنجدان، ڕشانەوە، گیرانی میز، وشکبوونەوەی دەم، تێکچونی بینین، سەرگێژبوون، سەرئێشە، بێحاڵی، خەمۆکی، خرۆشان، زیادلێدانی دڵ، قەبزی، پەڵە.

**بینزۆیك ئەسید: BENZOIC ACID**

**ناوی بازرگانی:** Drazoic

**گروپی دەرمانی: وەرگیراوەکانی ترشی بینزۆیك.**

**گروپی چارەسەر:دژی کەڕوو.**

**شێوەی دەرمانی: گیراوە یان (BULK)یان مەڵهەم.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: ڕیزبەندی نەکراوە.**

کاریگەری لاوەکی: حەساسیەت، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سوربونەوە، وشکبوونەوەی دەم.

**بینزۆین تینکچەر: BENZOIN TINCTURE**

**گروپی دەرمانی: وەرگیراوەکان و پێکهاتەکانی بەنزۆیك ئەسید.**

**گروپی چارەسەر: چارەسەری هەوکردنە ڤایرۆسییەکان.**

**شێوەی دەرمانی:** (BULK)

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: ڕیزبەندی نەکراوە.**

کاریگەری لاوەکی:حەساسیەتی پێستی، سوربونەوە، ئاوسان، ڕوشان، پەڵە، ئازار، خوران، بەگرانی هەناسەدان.

**بینزۆیل پیرۆکساید: BENZOYL PEROXIDE**

**ناوی بازرگانی:** Benoxyl

**گروپی دەرمانی: کراتۆلایتیکەکان.**

**گروپی چارەسەر: دژی زیپکە – دژی بەکتریا.**

**شێوەی دەرمانی:** گیراوە (لۆشن)، جێڵی مەوزوعی.

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا:** گروپی C.

کاریگەری لاوەکی: وشکبوونەوەی پێست، سوتانەوە، ڕوشانی پێست، توێك هەڵدانی پێست، بلۆقکردنی پێست، هەوکردنی پێست، حەساسیەتی پێست.

**بێنزۆترۆپین: BENZTROPIN MESYLATE**

**ناوی بازرگانی:** Cogentin

**گروپی دەرمانی:** ئەنتی کۆلینێرجیك.

**گروپی چارەسەر:** دژی پارکینسۆن.

**شێوەی دەرمانی:** ئەمپوڵ و حەب.

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا:** گروپی C.

کاریگەری لاوەکی: هێڵنجدان، ڕشانەوە، گیرانی میز، وشکبوونەوەی دەم، تێکچونی بینین، سەرگێژبوون، سەرئێشە، بێحاڵی، خەمۆکی، خرۆشان، زیادلێدانی دڵ قەبزی، پەڵە.

**بێنزیل بێنزوات: BENZYL BENZOAT**

**ناوی بازرگانی:** Anusol

**گروپی دەرمانی:** بەنزایلەکان.

**گروپی چارەسەر:** دژی گەڕی و ئەسپێ.

**شێوەی دەرمانی:** (BULK).

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا:** گروپیX .

کاریگەری لاوەکی: ڕوشانی پێست، ڕوشانی چاو، تەشەنوج لەکاتی خواردنی.

**بیفنیۆم هایدرۆکسی نفتوات: BEPHENIUM HYDROXY NAPHTHOATE**

**ناوی بازرگانی:** Alcopar

**گروپی دەرمانی:** هاندەری وەرگری کۆلینێرجیك.

**گروپی چارەسەر:** دژی کرم.

**شێوەی دەرمانی:** گرانیوڵی (٥ گرەم).

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا:** گروپی C.

کاریگەری لاوەکی: هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچون، سەرئێشە، سەرگێژبوون.

**بیتاكارۆتین: BETACAROTENE**

**ناوی بازرگانی:** Solatene

**گروپی دەرمانی: پرۆڤیتامین A.**

**گروپی چارەسەر: پارێزەری پێست.**

**شێوەی دەرمانی: كەپسول.**

**بەكارهێنانی لە سكپڕیدا: گروپی C.**

كاریگەری لاوەكی: سوتانەوە، تێكچونی پێست، گۆڕانی ڕەنگی پێست بەزەرد، سكچون، شلبوونەوەی پیسایی، ئازاری جومگە.

**بیتاهیستین: BETAHISTIN**

**ناوی بازرگانی:** Betasere

**گروپی دەرمانی: گروپی هیستامینی.**

**گروپی چارەسەر: دژی سەرگێژبوون.**

**شێوەی دەرمانی: حەبی ٨ میلی گرەمی.**

**بەكارهێنانی لە سكپڕیدا: موتالەعە نەكراوە.**

كاریگەری لاوەكی: هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرئێشە، تێكچونی گەدە، خوران، پەڵە.

**بیتامیتازۆن: BETAMETHAZONE**

**ناوی بازرگانی:** Celestone

**گروپی دەرمانی: گلوكۆكۆرتیكۆید (كۆرتۆن).**

**گروپی چارەسەر: دژی ئیلتیهاب، كپكەرەوەی بەرگری.**

**شێوەی دەرمانی: حەب و ئەمپوڵ.**

**بەكارهێنانی لە سكپڕیدا: گروپی C.**

كاریگەری لاوەكی: سەرئێشە، سەرگێژبوون، زیادبوونی ئارەزوی خواردن، زیپكە، زیادبوونی پەستانی ناوەوەی مێشك، زۆربوونی موو، هیلاكبون، بێهێزی، زیادبوونی كێش، بێخەوی، ناجێگیری، پوكانەوەی ئێسك، كەمبوونەوەی پۆتاسیۆم.

**بیتامیتازۆن (گوێی، چاوی): BETAMETHAZONE**

**ناوی بازرگانی:** Betnesol

گروپی دەرمانی: کۆرتۆن.

گروپی چارەسەر:دژی ئیلتیهاب.

شێوەی دەرمانی: مەڵهەمی چاوی یا گوێی یا قەترەی لوتی.

بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی C.

**بیتامیتازۆن - ئێن: BETAMETHAZONE- N**

ناوی بازرگانی: Betnesol- N

گروپی دەرمانی: کۆرتۆن.

گروپی چارەسەر:دژی ئیلتیهاب.

شێوەی دەرمانی: قەترە – مەڵهەم.

بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی C.

**بیتاکسۆلۆل: BETAXOLOL**

ناوی بازرگانی: Betoptic

گروپی دەرمانی: ڕێگری وەرگرەکانی بێتا.

گروپی چارەسەر: دژی ئاوی ڕەشی چاو (گلوکۆما).

شێوەی دەرمانی: قەترە.

بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی C.

کاریگەری لاوەکی: ناڕێکی لێدانی دڵ هێڵنجدان، ئازاری گەدە، نەمانی ئارەزوی خواردن، ئاوسان، زەردی، خەمۆکی، ئازاری جومگە، ڕشانەوە، لاوازی سێکسی، خەمۆکی، هیلاکی، خەوزڕان.

**بیثانیکۆل: BETHANECHOL CHOLORIDE**

ناوی بازرگانی: Urecholine

گروپی دەرمانی: کۆلینێرجیك.

گروپی چارەسەر: هاندەری دەستگای میزەڕۆ و هەرس.

شێوەی دەرمانی: حەبی ١٠ میلی گرەمی.

بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی C.

کاریگەری لاوەکی: هێڵنجدان، ڕشانەوە، کرژبوونی سك، سەرئێشە، سکچون، تەنگەنەفەسی، خیزەخیز، گێژی، خەواڵویی، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ئارەقکردنەوە، بچوکبوونەوەی بیلبیلەی چاو، سەرگێژبوون، سوربونەوە.

**بایپیریدین: BIPERIDEN**

**ناوی بازرگانی:** Akineton

**گروپی دەرمانی: ئەنتی کۆلینێرجیك.**

**گروپی چارەسەر: دژی پارکینسۆن.**

**شێوەی دەرمانی: حەبی ٢ میلی گرەمی، ئەمپوڵی ٥ میلی گرەمی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی** C.

کاریگەری لاوەکی: وشکبوونی دەم، ڕشانەوە، سەرئێشە، سەرگێژبوون، ناجێگیری، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، قەبزی، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ.

**بیزاکۆدیل: BISACODYL**

**ناوی بازرگانی:** Biscolax

**گروپی دەرمانی: وەرگیراوەکانی دایفنیل میثان.**

**گروپی چارەسەر: ڕەوانکەر و هاندەری دەستگای هەرس (ڕەوانکەر).**

**شێوەی دەرمانی: حەب و شاف ٥ و ١٠ میلی گرەمی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی** C.

کاریگەری لاوەکی:خەواڵویی، نەمانی ئارەزوی خواردن، خوێنبەربوون، ئازاری گەدە، گێژی، سکچون، تینوێتی، پەلە، هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچون، ئازاری سك، غازات، سوتانەوەی کۆم لەکاتی بەکارهێنانی شاف، تێکچونی ئەلیکترۆلیتی لەش.

**بیسمەث سەبسیترمیت: BISMUTH SUBCITRATE**

**ناوی بازرگانی:** Pepto-Bismol

**گروپی دەرمانی: پێکهاتەکانی بیسمەث.**

**گروپی چارەسەر:دژی برینی گەدە و ڕیخۆڵە، دژی سکچونی سەفەری.**

**شێوەی دەرمانی: حەبی ١٢٠ میلی گرەمی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی**D.

کاریگەری لاوەکی: قەبزی، بەگرانی هەناسەدان، ڕەشبوونی پیسایی.

**بلیۆمایسین: BLEOMYCIN SULPHATE**

**ناوی بازرگانی:** Blenoxane

**گروپی دەرمانی: ئەنتی بایۆتیك.**

**گروپی چارەسەر: دژی شێرپەنجە.**

**شێوەی دەرمانی: ئەمپولی ١٥ یەکەیی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی** D.

کاریگـەری لاوەکـی: سەرئێـشە، تەنگەنەفەسـی، هێڵنجـدان، ڕشـانەوە، سکـچون، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، زیپکە، خوران، هەڵوەرینی موو، ئاوسان، برینی زمان، تـا، لەرز، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، کەمبوونەوەی کێش، سوربونەوە، خوران، پەڵە.

**بۆریك ئەسید: BORIC ACID**

**ناوی بازرگانی:** Borfax

**گروپی دەرمانی: ترشە کانزاییەکان.**

**گروپی چارەسەر: دژی بەکتریا، دژی کەڕووی لاواز.**

**شێوەی دەرمانی: بەفەلی و گیراوە.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: موتالەعە نەکراوە.**

کاریگەری لاوەکی: حەساسیەتی مەوزوعی پێست، سکچون، کاریگەری لەسـەر جگـەرو گورچیلە هەیە.

**بۆتولینیۆم تۆکسین - ئەی: BOTULINUM TOXIN-A**

**ناوی بازرگانی:** BOTOX-Dysport

**گروپی دەرمانی: نیورۆتۆکسین– ڕێگری دەماری ماسولکەیی.**

**گروپی چارەسەر: خاوکەرەوەی ماسولکەیی.**

**شێوەی دەرمانی: ڤیاڵ (دەرزی).**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی** C.

کاریگەری لاوەکی: ڕوشانی چاو، فرمێسك ڕشتن، وشکبوونەوە و برینـی کۆرنیـەی چـاو، وشکبوونەوەی دەم، هەستیاربوون بە ڕوناکی.

**بۆتولیسم ئەنتی تۆکسین: BOTULISM ANTITOXIN E- MONOVALENT**

**گروپی دەرمانی: دژی ژەهر بۆتۆلیسم (میکرۆبی زۆر مەترسیدار).**

**گروپی چارەسەر: ئاوگی بەرگری بۆتۆلیسم (ژەهری جۆری E).**

**شێوەی دەرمانی: ڤیالی دەرزی لێدان.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: موتالەعە نەکراوە.**

کاریگەری لاوەکی: حەساسیەت، بلۆقکردن، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن.

**بریتلیۆم تۆسیلەیت: BRETLYUM TOSYLATE**

**ناوی بازرگانی:** Bretylol

**گروپی دەرمانی: ڕێگری وەرگری ئەدرینێرجیکەکان.**

**گروپی چارەسەر: چارەسەری نارێکی لێدانی دڵی.**

**شێوەی دەرمانی: ئەمپوڵی ٥٠ میلی گرەمی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی C.**

کاریگەری لاوەکی: هێڵنجدان، ڕشانەوە، سەرگێژبوون، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن.

**بریمۆنیدین تارتارەیت: BREIMONIDINE TARTRATE**

**ناوی بازرگانی:** Alphagan

**گروپی دەرمانی: وەرگری ئەلفا دوو ئەدرینێرجیك.**

**گروپی چارەسەر: مایۆتیکەکان (بچوککەرەوەی بیلبیلەی چاو)، دژی ئاوی ڕەشی چاو.**

**شێوەی دەرمانی: قەترەی چاوی ٠,٢ ٪.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی B.**

کاریگەری لاوەکی: سەرئێشە، سەرگێژبوون، خەوالویی، خەمۆکی، دڵەڕاوکێ، بێخەوی، هێڵنجدان، سوربونەوەی پێڵوی چاو، سوتانەوەی چاو، خوران، دڵەکوتێ، ڕشانەوە، سکچون، تێکچونی بینین، کۆکە، وشکبوونەوەی دەم.

**برینزۆلامید (چاوی): BRINZOLAMIDE ( OPHTALMIC )**

**ناوی بازرگانی:** Azopt

**گروپی دەرمانی: ڕێگری کاربۆنیك ئەنهایدرەیز.**

**گروپی چارەسەر: دژی ئاوی ڕەشی (چاو).**

**شێوەی دەرمانی: سەسپێنشن ١٪.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی C.**

کاریگەری لاوەکی: وشکبوونەوەی چاو، کزانەوەی چاو، تێکچوونی بینین، فرمێسك ڕشتن، سەرئێشە، هێڵنجدان، سکچون، سەرگێژبوون، ئازاری گورچیلە، ئازاری قەفەسەی سنگ.

**برۆمهێکسین هایدرۆکلۆراید: BROMHEXIN HCL**

**ناوی بازرگانی:** Bisolvon

**گروپی دەرمانی: ئێکسپێکتۆرانت.**

**گروپی چارەسەر: بەڵغەم دەرکەر.**

**شێوەی دەرمانی: شروب، حەب، ئەمپوڵ.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی C.**

کاریگەری لاوەکی:سەرئێشە، گێژی، پەڵەی پێست، ئارەقکردن، نارەحەتی دەزگای هەرس.

**برۆمۆکریپتین: BROMOCRIPTINE**

**ناوی بازرگانی:** Parlodel

**گروپی دەرمانی: هاندەری دوپامینیرجیك.**

**گروپی چارەسەر: ڕێگری هۆرمۆنی دەردانی پرۆلاکتین.**

**شێوەی دەرمانی: حەبی ٢,٥ میلی گرەمی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی B.**

کاریگەری لاوەکی:سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێخەوی، خەمۆکی، وشکبوونەوەی دەم، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، سکچون، ئازاری سك، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، زۆر میزکردن، تەنگەنەفەسی، تێکچونی بینین، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن.

**بوپی ڤاکائین: BUPIVACAINE**

**ناوی بازرگانی:** Marcaine

**گروپی دەرمانی: وەرگیراوەکانی ئەمایدی.**

**گرووپی چارەسەر: بێهۆشکەری نوخاعی و دەماری موحیطی.**

**شێوەی دەرمانی: دەرزی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی C.**

کاریگەری لاوەکی:سەرئێشە، لەرزین، خەمۆکی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، سەرگێژبوون، کەمبوونەوەی هۆشیاری، کەمبوونەوەی لێدانی دڵ، هێڵنجدان، ڕشانەوە، تەشەنوج.

**بوپرینۆرفین: BUPRENORPHIN**

**ناوی بازرگانی: Buprenex**

**گرووپی دەرمانی: هاندەری بێهۆشکەرەکان.**

**گرووپی چارەسەر: دژی ئازار (بێهۆشکەر).**

**شێوەی دەرمانی: ئەمپوڵ.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی C.**

کاریگەری لاوەکی: سەرئێشە، سەرگێژبوون، ناڕێکی لێدانی دڵ، خەوالّویی، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، گیرانی میز، خوران، ئارەقکردن.

**بوپرۆپیۆن: BUPROPION**

**ناوی بازرگانی: Wellbutrin**

**گرووپی دەرمانی: ئەمینۆکتۆن.**

**گرووپی چارەسەر: دژی خەمۆکی.**

**شێوەی دەرمانی: حەبی ١٠٠ و ٧٥ و ١٥٠ میلی گرەمی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی B.**

کاریگەری لاوەکی:سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێهێزی، بێخەوی، خەمۆکی، گێژی، پەلە، ناڕێکی لێدانی دڵ بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، تێکچونی هەستی تامکردن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، سکچون، تێکچونەکانی بێ نوێژی، وشکبوونەوەی دەم، خراپی هەرس، لاوازی سێکسی، تا، لەرز، هەوکردنی جومگە، تێکچونی بینین، خوران، حەساسیەت، کرژبوونی بۆری هەوا، تێکچونی بیستن.

## مەڵهەمی سوتان: BURN OINTIMENT

**ناوی بازرگانی:** Desitin

**گروپی دەرمانی:** دژی سوتان.

**گروپی چارەسەر:** دژی ئیلتیهاب.

**شێوەی دەرمانی:** مەڵهەم.

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا:** بێ مەترسی (هەر چەند لێکۆڵینەوەکان بۆ ترسناکبوونی دەرمان ئەنجام نەدراوە).

## بوسیرلین: BUSERELIN ACETATE

**ناوی بازرگانی:** Super fact

**گروپی دەرمانی:** دژی نیۆپلازم (لوو).

**گروپی چارەسەر:** هۆرمۆنەکانی هاندەری (LHRH).

**شێوەی دەرمانی:** ئەمپوڵ و سپرای لوت.

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا:** گروپی B.

کاریگەری لاوەکی: کەمبوونەوەی کێش، نەمانی ئارەزوی خواردن، سەرئێشە، ئۆدیما، بێخەوی، ڕشانەوە، هەوکردنی پێستی، سەرگێژبوون، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، گۆڕانی ECG، قەبزی، کەمخوێنی-هێڵنجدان، زیادبوونی ئارەقکردن، تەنگەنەفەسی، برینی لوت، زۆر میزکردن.

## بەسپیرۆن هایدرۆکلۆراید: BUSPIRON HCL

**ناوی بازرگانی:** Buspar

**گروپی دەرمانی:** ئازاسپیرودیکاندیون.

**گروپی چارەسەر:** دژی دڵەڕاوکێ.

**شێوەی دەرمانی:** حەبی ٥ میلی گرەمی.

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا:** گروپی B.

کاریگەری لاوەکی: ئازاری سنگ، زۆرلێدانی دڵ سکچون، وشکبوونەوەی دەم، سەرئێشە، سەرگێژبوون، هێڵنجدان، بێهێزی.

**بوسولفان: BUSULFAN**

**ناوی بازرگانی:** Myleran

**گروپی دەرمانی: ئەلکیلەیتین ئەیجنت.**

**گروپی چارەسەر: دژی شێرپەنجە.**

**شێوەی دەرمانی: حەبی ٢ میلی گرەمی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی** D.

کاریگەری لاوەکی:سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێخەوی، هیلاکبوون، خەوالّوی، ئازاری قەفەسەی سنگ، زیادبوونی لێدانی دڵ، سکچون، قەبزی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، کەمخوێنی، گەورەبوونی مەمك، کەمبوونەوەی خڕۆکە سپی یەکانی خوێن، بەردی گورچیلە، تێکچونی گورچیلە، پەڵە، وشکبوونەوەی پێست، هەڵوەرینی موو، کۆکە، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، تەنگەنەفەسی.

**کابێرگۆلین: CABERGOLIN**

**ناوی بازرگانی:** Dostinex

**گروپی دەرمانی: هاندەری وەرگری دوپامین** D٢.

**گروپی چارەسەر: ڕێگری تەرەشوحی پرۆلاکتین.**

**شێوەی دەرمانی: حەبی ٠,٥ و ١ میلی گرەمی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی** B.

کاریگەری لاوەکی:سەرئێشە، سەرگێژبوون، بێهێزی، خەمۆکی، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، سکچون، غازات، ئازاری سك، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، بێخەوی، ئازاری مەمك.

**کافائین: CAFFEINE**

**ناوی بازرگانی:** Vinuphos

**گروپی دەرمانی: ئەلکالۆید.**

**گروپی چارەسەر: بزوێنەر پەسەندی کۆئەندامی دەماری.**

**شێوەی دەرمانی: لە پێکهاتەی لەگەڵ** A.C.A.

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی نی یە.**

کاریگەری لاوەکی:هێڵنجدان، ڕشانەوە، بێخەوی، تەشەنوج، تێکچونی هەرس.

**کاید ئۆیل: CADE OIL**

**گروپی دەرمانی: ڕۆنەکانی پێستی.**

**گروپی چارەسەر: دژە هەوکردنەکان و دژی خورانی پێست.**

**شێوەی دەرمانی: تۆپەڵی قەبارەدارکراو ( مەڵهەم، شامپۆ )، فەل.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: موتالەعە نەکراوە.**

کاریگەری لاوەکی: زیپکە، ئیلتیهابی پێست.

**کالامین: CALAMINE**

**ناوی بازرگانی:** Calamox

**گروپی دەرمانی: ئۆکسیدەکانی زینك و ئاسن.**

**گروپی چارەسەر: دژی خورانی مەوزوعی.**

**شێوەی دەرمانی: لۆشن و کرێمی مەوزوعی (٨٪).**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی A.**

کاریگەری لاوەکی:ئیلتیهابی سوکی پێست، سوربونەوە، پەڵە.

**کالسیپۆتریۆل: CALCIPOTRIOL**

**ناوی بازرگانی:** Dovonex

**گروپی دەرمانی: ئانالۆگ ڤیتامین D٣.**

**گروپی چارەسەر: دژی سوریازیس.**

**شێوەی دەرمانی: مەڵهەمی مەوزوعی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی C.**

کاریگەری لاوەکی:خوران، ڕوشانی پێست، هەوکردنی پێست، پەڵە، خوران، سوربونەوە، وشکبوونەوەی پێست، سوتانەوە.

**کالسیتونین: CALCITONIN**

**ناوی بازرگانی:** Salmon

**گروپی دەرمانی: پۆلی پیپتید – هۆرمۆنی ثایرۆید.**

**گروپی چارەسەر: دژی پوکانەوەی ئێسك ( ئۆستیۆپۆرۆسس ).**

**شێوەی دەرمانی: دەرزی و سپرای لوتی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی C.**

کاریگەری لاوەکی: سەرئێشە، سەرگێژبوون، هیلاکبوون، ئازاری سك، گیرانی لوت، ئازاری چاو، خوران، پەڵە، زۆر میزکردن، لەرز، حەساسیەت، شۆك، ئازاری کەمەر، خوێنبەربوون، سوتانەوە، هێڵنجدان، سکچون، ئازاری سنگ، ڕشانەوە.

**کالسیتریۆل: CALCITRIOL**

**ناوی بازرگانی:** Rocaltrol

**گرووپی دەرمانی: ئەنالۆگی ڤیتامین D.**

**گرووپی چارەسەر: دژی هایپۆکالسیمیا (کەمبونەوەی کالسیۆمی لەش).**

**شێوەی دەرمانی: کەپسولی ٠,٢٥ مایکرۆگرەمی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی C.**

کاریگەری لاوەکی:سەرئێشە، بێخەوی، بێهێزی، نارێکی لێدانی دڵ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، قەبزی، هەوکردنی پەنکریاس، وشکبوونەوەی دەم، کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن، خوران، ناجێگیری، بەردی گورچیلە، ئازاری ماسولکەو ئێسك، کەمبوونەوەی کێش، کەمبوونەوەی ئارەزوی سێکسی.

**کاربۆناتی کالسیۆم: CALCIUM CARBONAT**

**ناوی بازرگانی:** D٥-Cal

**گرووپی دەرمانی:خوێیەکان و ئەلیکترۆلیتەکان.**

**گرووپی چارەسەر: ئەنتی ئەسید،پێکهاتەی یارمەتیدەری کالسیۆم.**

**شێوەی دەرمانی: حەبی ٥٠٠ میلی گرەمی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی C.**

کاریگەری لاوەکی: هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، قەبزی، وشکبوونەوەی دەم، سەرئێشە، کەمبوونەوەی فۆسفات، زۆربوونی کالسیۆم.

**کالسیۆم کلۆراید: CALCIUM CHOLORIDE**

**ناوی بازرگانی:** Posture

**گرووپی دەرمانی: جێگرەوەی کالسیۆم.**

گرووپی چارەسەر: تێکچوونی ئەلیکترۆلینی.

شێوەی دەرمانی: دەرزی (١٠٠ میلی گرەمی).

بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی C.

کاریگەری لاوەکی: دروستبوونی بەردی گورچیلە، هەستکردن بەسوتانەوەی شوێنی دەرزی لێدان، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن.

**کالسیۆم – دی: CALCIUM- D**

گرووپی دەرمانی: کالسیۆم + ڤیتامین D.

گرووپی چارەسەر: تەواوکەرە خۆراکییەکان.

شێوەی دەرمانی: حەبی پێکهاتەی کالسیۆم و ڤیتامین D.

بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپیC .

کاریگەری لاوەکی: هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، قەبزی، وشکبوونەوەی دەم، نەمانی ئارەزوی خواردن، زۆربوونی کالسیۆم.

**کالسیۆم: CALCIUM- FORTE**

ناوی بازرگانی: Calcium sandozforte

گرووپی دەرمانی: جێگرەوەی کالسیۆم.

گرووپی چارەسەر: ئەلیکترۆیتەکان.

شێوەی دەرمانی: حەبی فوارەی کالسیۆم.

بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی A.

کاریگەری لاوەکی:هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، قەبزی، وشکبوونەوەی دەم، نەمانی ئارەزوی خواردن، زۆربوونی کالسیۆم.

**کالسیۆم دوبیسیلەیت: CALCIUM DOBESILATE**

گرووپی دەرمانی: تەواوکەرەکانی کالسیۆم.

گرووپی چارەسەر: چارەسەری تێکچوونەکانی دەمار.

شێوەی دەرمانی: حەبی ٢٥٠ میلی گرەمی.

بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: باسنەکراوە.

کاریگەری لاوەکی: هێڵنجدان، ڕشانەوە، ئازاری سك، قەبزی، وشکبوونەوەی دەم، نەمانی ئارەزوی خواردن، زۆربوونی کالسیۆم.

**کالسیۆم - گلوکۆنەیت: CALCIUM - GLUCONATE**

**ناوی بازرگانی:** Kalcinate

**گروپی دەرمانی:جێگرەوەی کالسیۆم.**

**گروپی چارەسەر: تێکچونەکانی ئەلیکترۆلیتی.**

**شێوەی دەرمانی: حەب و ئەمپولٚ.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی** A.

کاریگەری لاوەکی: زۆربوونی کالسیۆم، هێڵنجدان، ئازاری سك، بێهێزی، نارێکی لێدانی دڵ، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، خوێنبەربوون، ڕشانەوە، بەردی گورچیلە.

**کالسیۆم پانثوتینەیت: CALCIUM- PANTHOTENATE**

**ناوی بازرگانی:** Pantenil

**گروپی دەرمانی: ترشی پانثوتنیك.**

**گروپی چارەسەر: ڤیتامینەکانی** (B٥).

**شێوەی دەرمانی: حەبی ١٠٠ میلی گرەمی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی** C.

**کاپریۆمایسین: CAPREOMYCIN SULFAT**

**ناوی بازرگانی:** Capastat

**گروپی دەرمانی: ئەنتی بایۆتیك (ستریپتۆمایسین).**

**گروپی چارەسەر:دژی سیل** (TB).

**شێوەی دەرمانی: ئەمپولی دەرزی لێدان.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی** C.

کاریگەری لاوەکی:تێکچونی گوێ، سەرئێشە، تێکچونی هاوسەنگی، تێکچونی گورچیلە، حەساسیەت، ئازار، ئاوسان، لاوازی ماسولکەیی، پەڵە، نارێکی لێدانی دڵ تا، لەرز، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم.

**کاپسیکیوم: CAPSICUM**

**ناوی بازرگانی:** Mentopin ٥٤٤

**گروپی دەرمانی: دژی ئیلتیهابەکانی مەوزوعی.**

**گروپی چارەسەر: دژی خوران.**

**شێوەی دەرمانی: لەزگە لە پارچە جیاوازەکان.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: موتالەعەی بوونی نییە.**

کاریگەری لاوەکی: ڕوشانی مەوزوعی، کۆکە، سوربونەوەی پێست.

**کاپتۆپریل: CAPTOPRIL**

**ناوی بازرگانی:** Capoten

**گروپی دەرمانی: ڕێگری گۆڕەری ئانجیوتانسین.**

**گروپی چارەسەر: کۆنترۆڵکردنی پەستانی خوێن و فراوانکەری دەمار.**

**شێوەی دەرمانی: حەبی ٢٥ و ٥٠ میلی گرەمی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپیC.**

کاریگەری لاوەکی:دابەزینی پەستانی خوێن، پەڵە، خوران، سەرگێژبوون، کەمبوونەوەی پۆتاسیۆم، ناتەواوی گورچیلە، زۆرمیزکردن، کەمخوێنی، کەمبوونەوەی خرۆکە سپی یەکانی خوێن، زیادبوونی لێدانی دڵ، تا، کۆکە، نەمانی ئارەزوی خواردن، نەمانی هەستی تامکردن.

**کارباکول (چاوی): CARBACHOL**

**ناوی بازرگانی:** Carbastate

**گروپی دەرمانی: پاراسیمپاثومیمیتیك.**

**گروپی چارەسەر: دژی ئاوی ڕەشی چاو (گلوکۆما).**

**شێوەی دەرمانی: قەترەی چاوی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی C.**

کاریگەری لاوەکی: هێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچون، فرمێسك ڕشتن، زۆربوونی لیك، ئارەقکردن، خوران، بچوکبوونەوەی بیلبیلەی چاو، کزانەوەی چاو، تەشەنوج، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، تێکچونی بینین، ئازاری چاو، سەرئێشە، ڕوشان، سوربونەوە.

**کاربامازیپین: CARBAMAZEPIN**

**ناوی بازرگانی:** Tegretol

**گروپی دەرمانی: وەگیراوی ئیمینۆستیلین.**

**گروپی چارەسەر: دژی تەشەنوج و ئازارەکانی دەماری.**

**شێوەی دەرمانی: حەبی ٢٠٠ و ٤٠٠ میلی گرەمی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی** C.

کاریگەری لاوەکی: گێژی، سکچون، تا، لەرز، کەمخوێنی، بێخەوی، بێهێزی، سەرگێژبوون، بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، هێڵنجدان، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزوی خواردن، ئازاری سك، وشكبوونەوەی دەم، پەڵە، تێکچونی بینین، ئیلتیهابی برینی دەم و زمان.

**کاربامید پیرۆکساید: CARBAMID PEROXIDE**

**ناوی بازرگانی:** Murine

**گروپی دەرمانی: دژە هەوکەرەکان.**

**گروپی چارەسەر: دژی ئیلتیهاب، دژی هەوکردن.**

**شێوەی دەرمانی: گیراوە.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی** C.

کاریگەری لاوەکیەکان: گێژی، پەڵە، ئازار، خوران، ڕوشان، خوێنبەربوونی گوێ، کەمبوونەوەی بیستن، ئاوسان.

**کاربنیسیلین: CARBENICILLIN**

**ناوی بازرگانی:** PYOPEN

**گروپی دەرمانی: ئەنتی بایۆتیکەکان.**

**گروپی چارەسەر: پەنسلینەکان (دژی سیدۆموناس).**

**شێوەی دەرمانی: حەب و ڤیالی دەرزی.**

**بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گروپی** B.

کاریگەری لاوەکی: تێکچونی هەرس، سکچون، هێڵنجدان، ئازاری سك، تا، لەرز، پەڵە، خوران، ڵێ، ڕشانەوە، سەرئێشە.

